# سۆفیە گومڕاکان کێن

## ناساندن و هەڵوەشاندنەوەی بیری باتڵ و پوچیان

نوسینی: مامۆستا ئازادی ڕزگاری

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

دوای سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و داواکردنی بارانی ڕەحمەت بۆسەر گیانی پێغەمبەر ﷺ داوا و تکامان وایە لە خوای بەخشندەی میهرەبان بمانکات بە میراتگری بەهەشت و کۆمانکاتەوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و یاوەرانی، ئامین!

سەرەتا بە ویستی خوا سۆفیایەتی و ڕێگاکانی هەڵدەوەشێنینەوە و دەیدەین لە بێژنگی ئیسلام، بۆئەوەی بۆمان دەرکەوێت تا چەند لە بازنەی ئیسلامدا شوێنی کراوەتەوە و ڕێگەی پێدەدرێت.

## بۆچونی زانایان دەربارەی سۆفیەتی

**امام شافعي (رحمه الله) دەفەرموێ:**
**ئەگەر کەسێك سەرەتای ڕۆژ بووە سۆفی، پێش ئەوەی نیوەڕۆی بەسەردا بێت ئەوا گەمژەیە.[١]**

**وشەی سۆفی نووسەران و مێژوونووسان لە کۆن و ئێستا بۆچوونی جیایان هەیە سەبارەت بە سەرەتای سەرهەڵدانی سۆفیایەتی و مانای وشەی سۆفی.**
**ئینجا بۆچوونەکانی زاناکانمان کۆکردۆتەوە و ئەوەی زیاتر لەلایەن زانا بەناوبانگەکانی سۆفییەکان باوە و زاناکانی سوننەش لەسەر ئەو بۆچوونەن کە سۆفیەکان خواپەرستی تەنها بە خۆشەویستی دەکەن و وازیان لە ترس و ئومێد هێناوە و تووشی گومڕایی بوونە.**

---

[١] - تلبیس إبلیس - لابن جوزي / ص ٣٧٠

## بۆچوونەکان

١- وشەی سۆفی لە (سۆفیا)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە، واتا دانا و پڕزان (الحكمة)، (أبو الريحان البيروني)، ٤٤٠ك.

٢- ئەم وشەیە لە (الصفا)وە هاتووە، واتا ڕوون و بەرچاو یان پاکوخاوێن.

٣- ئەم ناوە لە (أهل الصفة)وە هاتووە، کەسانێك بوون لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەژار و دەستکورت بوون لە گۆشەیەکی دیاریکراوی مزگەوت ژیانیان بەسەر دەبرد ژمارەیان جاری وا بووە گەیشتۆتە هەشتا کەس.

٤- ئەم وشەیە ئەوە دەگرێتەوە کە هەمیشە لە ڕیزی پێشەوەن لە پەرستنی خوادا.

٥- ئەم ناوە لە (بني صوفة)وە هاتووە، کە هۆزێك بوون خزمەتکاری کەعبەی پیرۆزیان دەکرد پێش هاتنی ئیسلام.

٦- یەکەم کەس کە خزمەتکاری ماڵی خوای کردووە پێیوتراوە (صوفة) کە ناوی (الغوث بن مر) بوو.

٧- ناوەکە دەگەڕێننەوە بۆ (صوفة بن بشر)، کە کابرایەکی ناودار بوو بە خواپەرستی پێش هاتنی ئیسلام.

٨- ناودارترین مێژوونووسی سۆفییەکان (السراج الطوسي) کە لە ساڵی ٣٧٥ك کۆچیدوایی کردووە لە پەرتوکە بەناوبانگەکەیدا (اللمع) لاپەڕە (٤)دا دەڵێت: ناوی سۆفی دەگەڕێتەوە سەر ئەو جلەی کە دەیانپۆشی و پێکهاتبوو لە خوری.

ئەم جۆرە جلوبەرگە پۆشاکی پێغەمبەری خوا (عیسا) و یاوەرەکانی بووە.

٩- (شيخ الاسلام ابن التيمية) لە (مجموعـة الفتاوی)دا دەفەرموێت لە کۆتاییدا ئەوەی زیاتر بەلای زانا پایەبەرزەکانی ئیسلامدا پەسەندکراوە، ئەم ناوە لە خورییەوە (الصوف)هاتووە، لەبەرئەوەی سەرەتای دەرکەوتن و پەیدابوونی سۆفیایەتی لەبەرکردنی ئەو پۆشاکەیە کە لە خوری پێکهاتبوو تا کردبوویان بە دروشمی خۆیان و ئەو ناوە ناوێکی کۆنە تا پێش هاتنی ئیسلامیش ئەم ناوە هەر باو بووە. وا دیارە سۆفییەکان لە لەبەرکردنی پۆشاکی خوری خۆیان بە شوێنکەوتووی پێغەمبەری خوا عیسا -علیه السلام- دەزانن.

بەڵام لێرە پرسیارێك دروست دەبێت: مەگەر موسڵمان شوێنکەوتووی پێغەمبەر ﷺ بێت چاکتر نییە؟ چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)[٢] واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ (بە ئیماندااران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت، دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خواش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهـ و هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە. پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمەی موسڵمان لەپێشترە کە شوێنکەوتوویی بکەین لە پێغەمبەرانی تر.

ئینجا با بزانین پیرۆزترین و چاکترین جلوبەرگ لەلای خۆشەویستی خوا دروودی خوای لەسەر بێت چی بووە:

---

[٢] - (آل عمران: ٣١).

(ثبت عن أنس أنه قال: كان أحب الثياب إلى رسول الله ﷺ يلبسه الحِبَرَة)[٣] ئەنەس ڕەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: خۆشەویسترین جلوبەرگ کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیپۆشی (الحِبَرَة) بوو.

(الحِبَرَة) قوماشێکە لە کەتان یان لۆکە دروست دەکرا و بۆیە دەکرا، کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو جلوبەرگەی لا خۆشەویست بوو و هەروەها زۆری بەکار هێناوە، پێکهاتبوە لە لۆکە(القطن) نەوەك لە خوری (الصوف)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناڵێین پێغەمبەری خوا ﷺ جلی پێکهاتوو لە خوری لەبەر نەکردووە.

بەڵام کە لەبەریشی کردووە، بۆ بەرگریی سەرما بووە لە زستاندا. وە یەکەم کەس کە نازناوی سۆفی بەخۆدا هەڵگرتووە، (أبو هاشم الكوفي)یە، کە لە کووفە لە عێراق لەدایك دەبێت و زۆری تەمەنی لە شام بەسەر دەبات و لە ساڵی ١٦٠ك کۆچیدوایی کردووە، ئەمە بۆچوونی (شيخ الاسلام)ە .

---

[٣] - رواه الشيخان

هەروەها دەڵێن یەکەم کەس کە ناوی سۆفی بەخۆدا هەڵگرتووە (عبدك _ عبدالكريم يان محمد)ە، کە لە ساڵی ٢١٠ك کۆچیدوایی کردووە.
ئەمە بۆچوونی شێخێکی ناوداری سۆفییەکانە بەناوی (حارث المحاسبی).
هەروەها (ابن نديم) دەفەرموێت یەکەم کەس کە ناوی سۆفی بەخۆدا هەڵگرت (جابر بن حيان)ە.
بۆ زانیاریتان ئەو کەسایەتییە شیعە بووە و شیعەکان بە گەورەی خۆیانی دەزانن.

## پێناسەی سۆفیایەتی

سۆفیایەتی بریتییە لە بزووتنەوەیەکی ئایینی سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە پێش کۆتاییی سەدەی دووەمی کۆچی تا سەدەی سێیەمی کۆچی.

سەرەتا لە تاکەکەسییەوە سەرهەڵدەدات و بانگەشەی خۆپاکڕاگرتن لە بێفەرمانیی خوا و بەندایەتیکردنی لەسنووربەدەر دەکات.

واتا زیادەڕەوی لە خواپەرستیدا بەمەبەستی لەخوا نزیککەوتنەوە.

ئەم چۆنیەتییە تیشکدانەوە (رد فعل)ی کەسانێك بوو کە پشتیان کردبووە خواپەرستی و ڕوویان لە دونیاوە بوو.

دواتر ئەم چۆنیەتییە پەرەی سەند و تایبەتمەندییان لەنێو خەڵکەوە دەرکەوت بەناوی سۆفی.

ڕۆژ بەدوای ڕۆژ ژمارەیان زیاد دەبوو تا بوون بە دیاردەیەکی بەرچاو.

سۆفی هەڵدەستێت بە پەروەردەکردنی دڵ و دەروون و لێکۆڵینەوە لە خودای میهرەبان لەڕێگەی هەستیارەی دڵەوە (الالهامات القلبية).

نەوەك دۆزینەوە و لێوردبوونەوە لە خوای پەروەردگار لەڕێگەی خوا

و پێغەمبەری خواوە ﷺ سۆفییەکان بۆ چۆنیەتیی دۆزینەوەی خوا لەسەر ئەم هەڵوێستە هەڵەیەیاندا (الالهامات القلبية) بەردەوام دەبن تا تێکەڵ بە فەلسەفەی هیندی و فارسی و یۆنانی و هی تری دەکەن. ئەگەر تۆزێك لێی ورد ببیتەوە، جیاوازیت بۆ دەردەکەوێت لەنێوان (الزهد) و سۆفیەتیدا.

(الزهد) ئەمە لە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ و هەروەها پێویستە، بەڵام سۆفیایەتی لادانێکی ڕوون و بەرچاوە لە ڕێگەی پێغەمبەر ﷺ و یاوەرەکانی.

## سەرهەڵدان و دەستپێکردنی سۆفیایەتی

سەرەتا نە لەکاتی پێغەمبەر ﷺ و نە لەکاتی (خلفاء الراشدين) تا وەفاتکردنی شێخ (حسن البصري)ش لە ١١٠ك، سۆفی ناسراو نەبوون و دیاردەیەك نەبوون نە بەناو نە بەشێوە نە بەڕەفتار، بەڵکوو ئەوەی کە باو بوو بۆ نموونە (موسوڵمان، ئیماندار) یان ناوی تایبەت وەك (الصحابي، البدري، اصحاب البيعـة، التابعي).

ئەو سەردەمانە ئەو جۆرە زیادەڕەوییە لە خواپەرستیدا و لە عەقیدەدا نەدەناسران، بەڵکوو بوونیان نەبوو تەنها کەسانێك نەبێت وەك تاکەکەس کە ئازاری خۆیان دەدا و زیادەڕەو بوون لە خواپەرستی، وەك ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەربەستی داونەتەوە لە زۆر شوێندا، بۆ نموونە ئەو سێ هاوەڵانەی هاتن پرسیاری چۆنیەتیی خواپەرستیی پێغەمبەریان کرد ﷺ لە خێزانەکانی پێغەمبەر، بۆئەوەی لە پێغەمبەری خوا زیاتر خوا بپەرستن. بۆیە وتیان ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ وا بەندایەتی خوا دەکات کە پێغەمبەرە، ئەی ئێمە؟ دەبێت لەو زیاتر بەندایەتیی خوا بکەین.

بۆیە یەکێکیان وتی من هەموو تەمەنم بەڕۆژوو دەبم.

ئەوەی تریان وتی هەموو شەوێک شەونوێژ دەکەم ناخەوم. ئەوەی تریان وتی تا تەمەنم هەیە ژن ناهێنم.

ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەو سێ هاوەڵانەی بیست، ناردی بەدوایان و وتی ئێوەن واتان وتووە؟

وتیان بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (اما والله انی لاخشاكم لله واتقاكم له لكني أصوم وأفطر ، وأقوم وأنام ، وأتزوج النساء ، فمن رغب عن سنتي فليس مني)[٤].. واتا: وەڵڵاهی من لە ئێوە لەخواترسترو تەقوادارترم لەگەڵ ئەمەشدا بەڕۆژوو دەبم و ڕۆژووش دەشکێنم، شەونوێژ دەکەم و دەشخەوم، هەروەها ژن دێنم ئینجا ئەوەی لەگەڵ ڕەفتارمان نەبێت، ئەوە لە ئێمە نییە.

---

٤ - متفق عليه

یان ڕووداوەکەی زەینەبە لە مزگەوتدا؛ گوریسێکی گرێ دابوو لەنێوان دوو ئەستوندەی مزگەوت بۆ ئەوەی کە توانای خۆڕاگرتنی هەبێت بۆ شەونوێژ کردن لەبەر خەدوا، ئەوا پاڵی پێوە بنێت و خۆی پێوە ڕابگرێت و لە نوێژکردندا بەردەوام بێت.

کە پێغەمبەر ﷺ گوریسەکەی بینی، فەرمووی: (ما هذا الحبل؟ قالوا لزينب، فأذا فترت تعلقت به فقال النبي ﷺ حلوه ليصليَ أحدكم نشاطه فاذا فتر فليرقد)[٥].. واتا: ئەو گوریسە چییە؟ وتیان ئەمە گوریسی زەینەبەیە، ئەگەر ماندوو بوو خۆی پێوە ڕادەگرێت تا لە شەونوێژدا بەردەوام بێت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی گوریسەکە بکەنەوە و لایبەن. با هەریەك لە ئێوە توانای هەبوو با نوێژ بکات ئەگەر توانای نەما با پاڵ بکەوێت.

---

[٥] - متفق عليه

بەو شێوەیە سەردەمی (صحابـة، تابعين وتابع التابعين) لەسەر ئەم بەرنامەیەی کە پێغەمبەر ﷺ بۆیانی دەستنیشان کردبوو بەردەوام بوون.

ئەو بەرنامەیە پەیداکردنی زانست و زانیاری و کارپێکردنی لە هەمان کاتدا و بەندایەتیی بۆخواکردن، ڕەنج و کۆششکردن بۆ بەخێوکردنی خاوخێزان لە یەك کاتدا و بەندایەتی و پەرستنی خوا و کۆششکردن (الجهاد). خواپەرستی و ڕێگری لە داهێنراوی نوێ (البدع) و دژایەتیکردنیان و بەرپەچدانەوەیان، هاوشێوەی ئیبن مەسعوود -خوا لێی ڕازی بێت- چۆن بوو بە ڕێگرێك لە زیکری بەکۆمەڵ لە مزگەوتی کووفە و کۆڕ و کۆمەڵەکانی پێداخستن وهەروەها بەرپەچدانەوەی بۆ (معضد بن يزيد العجلي) و جەماعەتەکەی، چۆن شوێنێکیان دەستنیشان کردبوو لە شاخ بۆ زیکر و وێردی خوا.

ئینجا ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ -خوا لێیان ڕازی بێت- بمابوونایە بۆ ئەمڕۆ، دەبوا چییان بە تەکیەکان بکردایە؟ با وەڵامەکە بۆ تۆ بێت.

کەواتە سۆفی نە بەناو نە بەچۆنیەتی نە وەکوو ئێستا کە هەیە لەو سەردەمانەی سەرەتای ئیسلام بوو، نەبوون؛ بەڵکوو ئەوەی کە باو بوو

بۆ نموونە (موسوڵمان، ئیماندار) یان ناوی تایبەت وەك (الصحابي، البدري، اصحاب البيعـة، التابعي).

ئەی چۆن و بۆچی سۆفییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی سۆفیایەتی کردووە یان ئیمامی عەلی یەکەم کەس بووە دانەری سۆفیایەتی یان (ابوبكر الصديق).

شێخ عبدالقادر گەیلانی، کە موشریکەکان هاواری بۆ دەکەن و دەڵێن: (غەوسی گەیلانی) یان (غەوسی بەغداد) چونکە قەبرەکەی لە بەغدادە، سۆفیەکان زۆر پێیەوە بەستەن و هەمیشە کەرامەتەکانی دەگێڕنەوە ڕاستی بێت یان دروستکراوی خۆیان بێت.

حەز دەکەم بزانن کە ئەم زانا بەڕێزە سۆفی نەبووە بەو مانایەی کە عەقیدەی شیرکی و خورافیاتی هەبێ، بەڵکو حەنبەلی بووە لەسەر عەقیدەی سەلەف ڕۆیشتووە رحمه الله.

## تێکەڵکردنی (الزهد) لەگەڵ بۆچوونی پەنهانی (الباطنية)

ئەو (الزهد)ەی کە پێویستە موسوڵمان لە ژیانی ڕۆژانەدا لە کار و کردەوەکانیدا تیشك بداتەوە، تێکەڵیان کرد لەگەڵ بۆچوونی پەنهانی (الباطنية) و لە ویست و ئارەزووی خۆیانەوە، نەوەك لە بنەمایەکی شەرعییەوە بێت؛ وە بیستنی وشەی سەیر لە زوبانیانەوە، وەك: (الوحدة، الفناء، الاتحاد، حلول، السكر، الصحو، الكشف، البقاء، المريد، العارف، الأحوال، والمقامات).

بەوەش وازیان نەهێنا تا بانگەوازی ئەمە دەرکەوت لەنێویاندا گوایە جیاوازی هەیە لەنێوان شەریعەت و حەقیقەتدا.

لە هەر سۆفییەك یان دەروێشێك بپرسە، دەڵێت شەریعەت جیایە لەگەڵ حەقیقەت: (التفرقة بين الشريعة والحقيقة). ئینجا خۆیان بە خاوەن هەقیقەت دەزانن، بەڵام موسوڵمانان و زانایانی ئیسلام بە خاوەنی شەریعەت دادەنێن یان (العلم الظاهر والعلم الباطن).

ئینجا بەلایانەوە خۆیان گەیشتوونەتە هەقیقەتی خواناسی، بەڵام زانایانی ئیسلام واتا: ئەوەی کە سۆفی نەبێت ئەوە لەسەر بەرنامەی خوایە (الشريعة) هێشتا نەگەیشتوۆتە دروستیی خواناسین، هەرچەندە خواپەرست بێت و شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت بێت تا نەبێتە سۆفی و بە ڕێگەی ئەواندا نەڕوات، بۆیە ئەو ڕەفتارە و بۆچوونەیان بوە مایەی ڕقلێهەڵسانیان لەلایەن زانایانی ئیسلام و دژایەتیکردنیان. هەروەها ڕەفتار و گوفتاری تریان کە نە لەو سێ سەدە پیرۆزەی یەکەمی ئیسلامدا و نە لە پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکانی، شتی وا بەدی نەکراوە بەم شێوەیە و نە جۆری یەکەمی سۆفیاتی لەسەر ئەم بۆچوون و ڕەفتارە بوون.

ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ سەرهەڵدانی سۆفیایەتی و دەرکەوتنیان بەتەواوی، وەك ئێستاش کە هەن. ناودارترین کەسایەتیی ئەو کۆمەڵەیە: (أبواليزيد البسطامي)، ٢٦٣ك: ئێرانی (ذوالنون المصري)، ٢٤٥ك: میسری (الحلاج)، ٣٠٩ك: ئێرانی (أبوسعيد الخزار)، ٢٦٨ك (الحكيم الترمذي)، ٣٢٠ك: ئێرانی (أبوبكر الشبلي)، ٣٣٤ك: ئێرانی

ئینجا چەند نموونەیەك دێنینەوە لە ناودارانی ئەم بەشی سۆفیاتییە و بۆچوون و گوفتارەكانیان دەدەینە بەر تەرازووی شەریعەت.

بەلای زۆرێك ئەمانە ئەولیان با بزانین ئەولیای چین!!

ذوالنون المصري (أبو الفیض ثوبان بن إبراهیم) بەبنەڕەت قیبتییە لە قیبتییەكانی (النوبة) لە گوندی (أخمیم) لە (الصعید) لە میسر.

لەساڵی٢٤٥ك كۆچیدوایی كردووە لە تەمەنی نەوەتساڵیدا.

وا دیارە تەریقەتی لەسەر دەستی (شقران المغربي العابد) یان (إسرائیل المغربي) وەرگرتووە.

بەگوێرەی باسەكەی (ابن خلكان و عبد الرحمن الجامي). هەروەها زاناكانی سۆفیەكانیش وەك (الشعراني) لەسەر ئەو بۆچوونەن بۆیە (الشعراني) لە باسی (شقران المغربي)دا دەڵێت: "(شقران المغربي العابد، شیخ ذی النون المصری." واتا شەقرانی مەغربی شێخەكەی (ذوالنون المصري)یە.

بەڵام سەیر لەوەدایە شیعەکان (الرافضة)دەڵێن (ذوالنون المصري) لەسەر دەستی (جابر بن حيان) زانای کیمیاناسی شیعە شارەزا بووە لە سۆفیایەتی و هەروەها (ابن النديم) لە پەڕتوکە ناودارەکەیدا (الفهرست) هەمان بۆچوونی هەیە لەمبارەوە.

وە (ابن خلكان) دەفەرموێت (ذوالنون المصري) کەسێك بووە لە (الملامتية)، کە ئەوانەن خواپەریستییەکەیان حەشار دەدا و بەڕووکەشیش خۆیان وا پیشان دەدا گاڵتەیان بە (الشريعة) دەهات، بۆ ئەوەی خەڵکی بە کەسی گەمژە و بێدینیان بناسێت، بۆ نموونە هەندێك لەو وەلییانەی کە گەیشتوونەتە پلەی (الملامتية)؛ ئەگەر گوێیان لە بانگ ببوایە دەیانگوت (اسكت يا كلب! لعنك الله!) بێدەنگ بە، سەگە! نەفرەتی خوات لێبێت! ئەمە شیخ الاسلام بەوشێوە باسیان لێوە دەکات.

بەڵێ، ئەمانە ئەولیان چۆن ئەولیایەك؟!!! (الملامتية)واتا هەمیشە سەرکۆنە و لۆمە کردنی نەفس لە هەموو کاتدا (ملامة النفس في كل الأحوال) و پەڕتوکێکیان هەیە بەو ناوە.

داهێنەرەکەی (أبي عبد الرحمن السُلمي)یە و ئەم وشەیەش لە داهێنراوەکانی سۆفییەکانە، بەڵام وا دیارە کەسێکی کەم پێی ئاگادارە.

هەروەها خاوەنی ئەو گوتە کوفرییانەیە (ذوالنون المصري) وەك (طاعة المريد لشيخه فوق طاعته ربه)[٦] واتا: گوێڕایەڵیی مورید بۆ شێخ لەسەرووی گوێڕایەڵیی خواوەیە.

لەگەڵ ئەمەشدا کەسێکی کاربەجێ و پڕبێژ بووە و نووسەرانی سۆفییەکان بە داهێنەری ڕاستەقینەی ڕێگای سۆفیایەتی دادەنێن لە (المحبة وە المعرفة): خۆشەویستیی خوا و ناسیندا.

وە یەکەم کەسە لە داهێنانی (العلم الظاهر وە العلم الباطن) لە شەریعەتی ئیسلامدا و (القشيري) دەڵێت: (أول من عرف التوحيد بالمعنى الصوفي) یەکەم کەسە پێناسەی بەیەکناسینی خوا دەکات بە واتا و بۆچوونی سۆفیایەتی.

---

[٦] -(تذكرة الأولياء: ١/١٧١).

وە بە بۆچوونی (ذوالنون المصري) ئەسڵی ئینسان دەگەڕێتەوە بۆ نووری پێغەمبەر ﷺ لەوانەیە ئەم وشەیەت چەندین جار گوێ لێبووە لە زاری بانگەوازکارانی سۆفیەکان و کادیرەکانیان.

هەروەها یەکەم کەسە لە کەسایەتییە سۆفییەکان، کە خوورەوشتی یۆنانییەکان کاریگەر بووە بەسەریدا و لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەدی دەکرا، بەتایبەتی بۆچوونە نوێکانی (أفلاطون)، بۆیە بۆچوونی تایبەتی هەبوو بۆ خواناسی و ونبوون و توانەوە لە خۆشەویستیی خوادا.

ئەم بۆچوونەی لە (الغنوصية) بۆ مابویەوە.

أبواليزيد البسطامي تەیفوور کوڕی عیسا کوڕی ئادەم کوڕی (شروسان) لە (بسطام) لەدایك دەبێت لە ئێران و بەبنەڕت زەردەشتییە.

گوتەی سەیر و پیس سۆفییەکان دەیگێڕنەوە بۆ ئەو، بۆیە لێکۆڵەرەوەکان بەگومانن لەم گوتانە کە هی ئەو بن، چونکە ئەم جۆرە گوتانە داوای خوایەتی دەکات و لە ئیسلام خاوەنەکەی پێدەردەچێت و کافر دەبێت، وەك: (خرجت من الحق إلى الحق حتى صاح فيّ يا من

أنت أنا فقد تحققت بمقام الفناء في الله)[٧]، واتا: لە حەق دەرچووم بۆ حەق -مەبەستی خوایە- تا هاواری کرد لەناومەوە ئەی تۆ منی گەیشتیت بەپلەی توانەوە و ونبوون لە خوادا.

وە دەڵێت: (خضت بحراً وقف الأنبياء بساحله.)[٨] واتا: لە دەریایەك پەڕیومەتەوە پێغەمبەران لە لێوارەکەیەوە وەستان.

وە دەڵێت: (لئن تراني مرة خير لك من أن ترى ربك ألف مرة)[٩] واتا: ئەگەر یەکجار من ببینیت، چاکترە بۆت لەوەی هەزار جار خوا ببینیت.

وە زۆر لەوە زیاتر هەیە ئەگەر بیخەمە بەرچاوی خوێنەر.

ئەگەر هەریەکە لەو ڕستانە بخەیتە دەریایەکان، بۆگەنی دەکات، بەڵام با لێرە بوەستین پرسیارێك لەو سۆفییانە بکەین ئەوانەی بەدوای خواپەرستیدا دەگەڕێن و گوێ نادەنە لۆمەی لۆمەکەران.

---

[٧] - آثار البسطامي، لاپەڕە ٤٩.
[٨] - آثار البسطامي، لاپەڕە ٤٩.
[٩] - آثار البسطامي، لاپەڕە ٥٢.

ئایا کەسێکی موسوڵمان ئەو جۆرە گوتەی لێبەدی دەکرێت؟!!! یان هیچیەك لە موسوڵمانان ئەوەی وتووە؟! ئەمە چۆن وەلییە؟ ئەمە چۆن پێشەوایەکە؟ ئەمە چۆن لەخواترساو بووە؟

بۆیە (شیخ الاسلام) گومانی هەیە لەوەی ئەم گوتانە هی ئەو بن، چونکە گوتەی تری هەیە پێدەچێت لەسەر بۆچوونی(أهل السنة والجماعة) بێت.

الحکیم الترمذي باوکی عەبدوڵلا موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی حوسەین (الترمذي)یە و لە ساڵی ٣٢٠ك کۆچیدوایی کردووە. ئەم کەسایەتییە (امام الترمذي)ی فەرمووەدەناس نییە.

یەکەم کەسایەتیی سۆفییەکانە کە باس لە کۆتاییهاتنی وەلی دەکات؛ واتا دەڵێت چۆن پێغەمبەرایەتی کۆتایی دێت، بەو شێوەیەش ئەولیا کۆتایی پێدێت: (للأولیاء خاتم کما ان للأنبیاء خاتماً).

هەروەها پەڕتوکێك لەسەر ئەو بابەتە دەونوسێت بە ناوی (ختم الولایة) و ئەم بۆچوونە نوێیە کە تێکەڵ بە سۆفیایەتی کرا، بووە بەمایەی ڕێخۆشکردن بۆ کەسانێك وەك (ابن عربیو ابن سبعین و ابن

هود و التلمساني) بانگێشەی ئەوە بکەن کە وەلین و بەدوای ئەوان وەلی تر نابێت.

وە هەروەها وەلی پلەوپایەی لە پلەوپایەی پێغەمبەران گەورەترە لەلایەن خواوە.

بەڵگە و دەلیلیشیان باسەکەی (خدری زیندە) و پێغەمبەری خوا (مووسا)یە لە سوورەتی (الکهف)دا؛ چۆن پێغەمبەری خوا دەبێت لە وەلییەك (علم) فێر ببێت، مەگەر پلەوپایەی لەلای خوا لە پێغەمبەران گەورەتر نەبێت! ئەمە جۆری دووەمی سۆفیایەتی بوو.

ترسناکترین جۆریان دەرکەوتنی بیرۆکەی (الحلول والاتحاد و وحدة الوجود) واتا "توانەوە لەگەڵ خوا و تێکەڵبوون بە خوا" و بوونی دروستکەر و دروستکراو هەر یەکە، خوا پەنامان بدات لەو لەڕێدەرچوونە.

فلا حول ولا قوة إلا بالله.

## جۆری سێیەمی سۆفیایەتی

تێکەڵکردنی سۆفیایەتی لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا ئەو جۆرە بیرۆکانە دەرکەوتن وەك (الحلول والاتحاد ووحدة الوجود) بە واتای ئەوەی کە هەیە بەڕاستی تەنها خوایە و جگەلە خوا هی تر خەیاڵە و هیچ بوونێکی نییە هاوشێوەی فەلسەفەکەیان، بەڵام داخ ئەوەیە کەسانێك ئەوڕۆ بەرگری دەکەن لەم بیرۆکەیە کە لە کوردستاندا زۆر باوە، بەتایبەتی چاکترین پەڕتوکیان ئێستا کە مەلایەکی سۆفی خەڵکی موسڵ دەبێت بەڵام باپیرەی موسڵ بەجێ دێڵێت بۆ (الجولان) لەوێوە بۆ (دمشق) ناوی (یوسف خطار محمد)ە و هەڵساوە بە بڵاوکردنەوەی ئەم پەرتوکە بە ناوی(الموسوعة اليوسفية في بيان أدلة الصوفية)، کە لە دوو بەرگ پێکهاتووە و زیاتر لە حەوسەد لاپەڕەیە. بەڵام زۆر بە فێڵزانانە درۆودەلەسەکانی وەرگێڕی ڕاستی دەکات و کەسانی ناشارەزای پێ لەخشتە دەبات.

سەرەنجامی تێکەڵکردنی سۆفیایەتی لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانی پاڵنەرێك بوو بۆ دەرکەوتنی بۆچونی (الفيض والإشراق) لەسەر دەستی (غزالي و السهروردی).

ئەم جۆرە سۆفیەتییە بە ترسناکترین جۆر دادەنرێت و بە خەراپترین قۆناغ لە قۆناغەکانی تێپەڕبوونی سۆفیایەتی دادەنرێت.

ئەو کاتەیە سۆفییەکان قۆناغی داهێنراوی کردەوەیان (البدع العملية) گواستەوە بۆ قۆناغێکی ترسناکتر، ئەویشیان قۆناغی داهێنراوی زانستییە (البدع العلمية).

بەوەوە سۆفی مەترسی بە لەئیسلامدەردەچوون بەتەواوی لێدەکەوێتەوە -خوا پەنامان بدات-.

ناودارترین کەسایەتیی ئەو کۆمەڵەیە (الحلاج)ئێرانییە، ٣٠٩ی کۆچی لەسێدارە دراوە لە بەغدا. (السهروردي)ئێرانییە، ٥٨٧-٦٦٥ی کۆچی لەسێدارە دەدرێت لە قەڵای (حلب) لە سووریا.

(ابن عربي) ئەندەلووسییە، ساڵی ٥٥٨ك لەدایك دەبێت و لە ساڵی ٦٣٨ی کۆچی مردووە لە (دمشق)لە سووریا.

(ابن سبعين) ئەندەلووسییە، لەنێوان ٦١٤-٦٦٩ك ژیاوە. (ابن الفارض)سوورییە، لەنیوان ٥٧٦- ٦٣٢ك ژیاوە.

ئینجا با بزانین ئەو زانایە ناودارانەیان یان ئەو وەلییە ناودارانەی سۆفییەکان چ جۆرە ناودارێك و چییان کردوە بۆ ئیسلام تا ناودار بن و بۆچوونیان چییە سەبارەت بە خوای پاك و بێگەرد! (الحـلاج) (أبو مغيث) حوسەینی کوڕی مەنسووری حەلاجە، لە ساڵی ٢٤٤ی کۆچی لەدایك دەبێت و لە ساڵی ٣٠٩ی کۆچی لەسێدارە دەدرێت.

لە ئێران لەدایك دەبێت و نەوەی پیاوێکی (زەردەشتی)یە و دواتر لە (واسط)لە عێراق گەورە دەبێت.

بەڵام سەیر لەوەدایە زەردەشتیاتیی هێشتا لێوە بەدی دەکرا.

لە کۆتاییی تەمەنیدا بە یەکێك لە قوتابییەکانی دەڵێت کەناوی (ابراهيم بن فاتك)ە کەی بیکەین بە نەورۆز(متى ننورز؟) لە وەڵامدا (ابن فاتك) پێیڕادەگەیەنێت و دەڵێت کەینێت مەبەستە (الحـلاج) دەڵێت (يوم أصلب) ئە وڕۆژەی لەخاچ دەدرێم.

چۆن نەورۆز کۆتاییی ساڵە و سەرەتای ساڵێکی تری نوێیە (هو نهاية سنة وبداية سنة جديدة) بەو شێوەیە نەورۆزی (الحـلاج) سەرەتای ژیانێکی تری نوێیەتی (هو بداية حياته الثانية).

ئەمە بۆچوونی شوێنکەوتووەکانییەتی و لە سوودان بەو شێوەیە باسی لێوە دەکەن، وەکوو (محمود محمد طه)ی لەسێدارەدرا و سەرقافڵەی سۆفییەکان.

بەهەمان شێوە سەرلەبەیانیی ڕۆژی هەینیی مانگی شەشی ساڵی ١٩٨٥ (محمود محمد طه) لەتەمەنی ٧٦-ساڵیدا لەسێدارە دەدرێت لە (الخرطوم)ی پایتەختی سوودان لەسەر بڕیاری زانایانی سوودان، چونکە هەمان بۆچوونەکانی (الحـلاج)ی دەبێت لە تێگەیشتن لە خودا و چەندین فەتوا و بڕیاری بێبنەما و سەیر دەدات بە ناوی نوێژەنکردنەوی ئیسلام.

(الحـلاج) لە بەناوبانگترین کەسایەتی دادەنرێت لەوانەی بانگەوازی لەخواتوانەوەیان دەکرد لەگەڵ بەیەکبوونی خوا و دروستکراوەکان (الحلوليين والاتحاديين).

هۆکاری لەسێدارەدانی (الحـلاج)؛ تۆمەتبار کرا بە کوفر چوار تۆمەتی نرا پاڵ تا لەسێدارە درا:

١– بوونی پەیوەندی لەگەڵ (القرامطة) شیعەکانی ئێستای بەحرین و سەعوودییە

٢ – خاوەنی ئەم گوتەیە (أنا الحق) "من حەقم"، مەبەستی خوایە

٣ – شوێنکەوتووەکانی باوەڕیان وا بوو (الحـلاج)خوایە

٤ – ڕەدکردنەوەی واجببوونی حەج زانایانی ئەو سەردەم هەموویان یەکدەنگ بوون لە هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام و کافربوونی، بۆیە بڕیاری لەسێدارەدانی بڕیارێکی شەرعیی گشتی بوو: (وأجمع علماء عصره على قتله بسبب ما نقل عنه من الكفر والزندقة).

بەڵام گاورەکان بەرگری لێدەکەن و بە کەسێکی زۆرلێکراو باسی لێوە دەکەن و مامە سۆفیش بە ئەولیا مەزەندەی دەکات!!

وە کەسێکی کپ و مۆن بووە و لەگەڵ ئەوەشدا توند و عیناد و خۆ گەورەگر بووە. خاوەنی کتبی (الطواسين)ە وا دیارە گاورەکان زۆر

گرینگی پێدەدەن، چونکە هەمان بیروبۆچوونی ئەوانی بووە لە یەکبوونی دروستکراو و دروستکەر.

نووسەری (المستشرق)ی فەرەنسی (ماسنیون) چاوی بۆ لە پەڕتوکێکی خشاندووە و تەحقیقی بۆ لێکردووە و بۆی لەچاپ داوە و هەروەها (بولس نويا اليسوعي)ش بیروت، ١٩٧٢ز.

لە گوتە سەیروسەمەرەکانی (الحـلاج)ی ناوداری سۆفی گوتەی پێچەوانەی شەرعی زۆرن ،بەڵکووو گوتەی کوفری کە خاوەنی پێ لە ئیسلام دەردەچێت و چەند گوتەیەکی دەخەمە بەرچاو، بۆ نموونە: (وما كان في أهل السماء موحد مثل إبليس): لە جێنیشینانی ئاسمان کەسیان وەك (إبليس) یەکخوا پەرست نەبوو.

(من زعم انه يوحد الله فقد أشرك)[١٠] ئەوەی بڵێت من خوا بە تەنها دەزانم، ئەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار دا؛ مەبەستی دروستکراو و دروستکەر یەکن و نابێت لەیەك جیا بینەوە.

---

[١٠] - طواسين الحلاج ٢١ - ٥٢:

ئەمەش لە ئایینە دەسکاریکراوەکەی گاورەکانەوە بۆیان ماوەتەوە، گوایە پێغەمبەری خوا (عیسا) (علیه السلام) کوڕی خوایە و لە خواش تواوەتەوە و خواشە.

وە کورە خوشکی (الحـلاج) دەڵێت کە نوسراوێکم بینی بە پێنووسی خاڵم (من فرّق بين الإيمان والكفر فقد كفر)[١١] ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان ئیمان و کوفرەوە، ئەوا کافر دەبێت.

ئینجا با بزانین زانایانی ئیسلام چۆن باسیان لێوە کردووە ئەو کەسایەتییەی هەوڵی لەناوبردنی حەلاجی دا و تا لیژنەیەکی بۆ پێکهێنا و بڕیاری لەسێدارەدانی دەرچوو، دادپەروەر(أبو عمر محمد بن يوسف المالكي) -ڕەحمەتی خوای لێبێت-،

(ابن كثير) لە پەڕتوکە ناودارەکەیدا (البداية والنهاية) مەدحی ئەو قازییە بەڕێزە دەکات و دەفەرموێت (وكان من أكبر صواب أحكامه وأصوبها قَتْلَهُ الحسين بن منصور الحلاج)[١٢] واتە لە گەورەترین

---

[١١] - طواسين الحلاج ٥٦:
[١٢] - البداية والنهاية ١١/١٧٢.

کاربەجێییەکانی ئەو دادپەروەرە دروسترین بڕیاری لەسێدارەدانی (حسين بن منصور الحلاج)ە، وە شێخی ئیسلام (ابن تيمية) -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەفەرموێت: (مَنْ اعْتَقَدَ مَا يَعْتَقِدُهُ الْحَلاجُ مِنْ الْمَقَالاتِ الَّتِي قُتِلَ الْحَلاجُ عَلَيْهَا فَهُوَ كَافِرٌ مُرْتَد)[١٣] واتا: ئەوەی باوەڕی بە بڕوای (الحلاج) هەبێت لەو گوتراوانەی لەسەری لەسێدارە دراوە، ئەو کەسە کافر و هەڵگەڕاوەیە لە ئیسلام.

وە (الإمام الذهبي) لە پەڕتوکی (سير أعلام النبلاء)دا دەفەرموێت: (كانت له بداية جيدة وتألە وتصوف، ثم انسلخ من الدين)[١٤]. واتا: سەرەتایەکی چاکی بوو لە سەرەتادا، دواتر داوای خوایەتی کرد و بوو بە سۆفی و لەدین دەرچوو.

دەتوانیت لەم سەرچاوانەدا زیاتر کەلك وەرگریت سەبارەت بە حەلاج(تاريخ بغداد للخطيب البغدادي ١١٢/٨-١٤١)، (المنتظم لابن

---

[١٣] - مجموع الفتاوى (٤٨٠/٢).
[١٤] - سير أعلام النبلاء: ٣٢٧/١٤

الجوزي ٢٠١/١٣-٢٠٦)، (سير أعلام النبلاء للذهبي ١٤ / ٣١٣-٣٥٤) و (البداية والنهاية لابن كثير ١٣٢/١١-١٤٤))

لەگەڵ ئەمەشدا زانا و ناودارانی سۆفییەکان بەرگری لێدەکەن و وتەکانی بە شتێکی پیرۆز دێننەوە لە پەڕتوکەکانیان، بەتایبەتی لە باسی بیروباوەڕدا.

لەپێشان وتەکانیان دەگواستەوە لە باس و خواسیان یان لە پەڕتوکەکانیان، بەڵام ناویان نەدەهێنا، بۆ نموونە: (أبي بكر محمد الكلاباذي) لە پەڕتوکی (التعرف على مذهب أهل التصوف)دا دەڵێت: قال أحد الكبراء واتا: یەکێك لە گەورەکان دەفەرموێت.

بەم شێوەیە گوتەکانی دەکاتە سەرچاوە بەڵام ناوی ناهێنێت.

ئەمە لەگەڵ (الحـلاج)ێتی و (السراج الطوسي) لە پەڕتوکی (اللمع)دا زیاتر لە پەنجا شوێن گوتەکانی (الحـلاج) دێنێتەوە، بەم شێوەیە: (قال بعضهم) یان (قال القائل)، کەچی ناوی ناهێنن.

بەڵام لە سەدەی پێنجەمی کۆچی بەولاوە ئیتر ناوی دەردەکەوێت لە پەڕتوکی سۆفیەی‌کان و مەدح و سەنای بۆ دەکەن، وەك (أبو حامد الغزالي)، (ابن عربي) و (عبد الغني النابلسي).

بەهەرحاڵ نزیکەی دووسەد ساڵ ناوی نەما و سڕایەوە.

دواتر بەناو دەرکەوتەوە و لەسەردەمی ئێستاشماندا هەر باس ناکرێت، بەڵکوو بە شەهید مەزەندی دەکەن و پەڕتوکی لەسەر بڵاو دەکەنەوە، وەك (طه عبد الباقي سرور) پەڕتوکێك بڵاو دەکاتەوە بە ناوی (الحلاج شهيد التصوف الإسلامي)، (قاسم محمد عباس) بە ناونیشانی (الحلاج - الاعمال الكاملة) و (سامي مكارم) بە ناونیشانی (الحلاج في ما وراء المعنى والخط واللون). لەگەڵ ئەمەش هەرچەندە زانایانی سەردەمی خۆی بە کافر و هەڵگەڕاوە لە دین لەقەلەمیان دا و لەسێدارە درا، ئێستا شەهیدە!! وە سەیری ئەم ماڵپەرە سۆفییە بکە، چۆن بە شانوباڵی هەڵدەدات و ئامۆژگارییەکانی دەکەنە بەڵگە بۆ بەردەوامییان لە سەر سۆفیاتی ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العضيم ئەوەندە بەسە ماڵپەڕی گاوەرەکان بە کەسێکی پیرۆز باسی بکەن و بڵێن باوەڕی بە

خوایەتیی (المسیح) بووە و دێڕەشیعرەکەشی دەهێننەوە لە دواهەناسەی کە لەسێدارە دراوە لەسەر بڕیاری خەلیفە (المقتدر بالله) سەرچاوە).[١٥]

ئینجا سەیر لەوەیە ئەمە شەهیدی تەریقەیە و گەورەکەسایەتی سۆفییەتە.

[١٥] http://vb.orthodoxonline.org/showthread.php?t=- ٥٠٤

## سۆفیگەری و یاریی خۆشاردنەوە

ناخۆشترین و زەحمەتترین لێکۆڵینەوە بەدواچوونە بۆ جیهانی سۆفیزم. مەسەلێکی جیهانی هەیە دەڵێت: گەشتێکی هەزار میلی بە هەنگاوێك دەست پێدەکا، بەڵام لە جیهانی سۆفیزمدا بەپێچەوانەوەیە؛ دەبێت لێکۆڵینەوە و بەدواچوون بۆ هەزار یان زیاتر تەریقە بکەیت بۆئەوەی لەگەڵ یەکێك لەو تەریقانەدا گفتوگۆ بکەیت یان تێبگەیت!

چونکە هەر تەریقەیەك لە تەریقەکان کتێب و سەرچاوە و ئیماماني خۆی هەیە کە پەیڕەوییان دەکەن. وە هەر هەمان تەریقەش، بۆ نموونە قادری لە عێراق پەیوەست نییە بە شێخەکان و سەرچاوە و کتێبەکانی هەمان تەریقە لە هند یان پاکستان یان جەزائیر وهتد... بەس لەناودا یەك دەگرنەوە ئەویش ئەوەیە کە هەموویان قادرین یان ڕفاعین یان هەر تەریقەیەکی تر.

لەکاتێکیشدا بە بەڵگە لە قورئان و سوننەتەوە بۆی ڕوون بکەیتەوە، ئەو کارەی دەیکات دوورە لە پەیڕەوەکانی خودای (جل وعلا) و پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ هیچکام لە سەحابە بەڕێزەکان لەم کار و عیباداتانەیان نەکردووە، ئەو دەڵێت تەریقەی ئێمە جودایە لە تەریقەکانی تر.

ئێمە ئەو شتانە ناکەین وەك حەزرەتی شێخ دەفەرموێت: دەکەوێتە باسی کەراماتی باوك و باپیرانی شێخەکەی و کتێب و سەرچاوەکانیان.

ئەم مەشهەدەش دووپات و هەزارپات دەبێتەوە لە تەریقەکاندا. کە ئەوان ڕێگە (طریقة) ڕاست دەکەن و ئەگەر هەر دەروێشێکیش تەریقەکەی بەجێ بهێڵێت و بچێتە سەر تەریقەیەکی تر، تووشی موسیبەتێکی گەورە دەبێت.

ئەمەشم وەك یارییەکی منداڵانە دێتە بەرچاو، کە دەست دەگرێت بە چاوەکانییەوە و وا دەزانێت کە دیار نییە و بەرامبەرەکەی نایبینێت!

با چەند پرسیارێك بکەین: چەند تەریقە هەیە لە جیهاندا؟

کامیان ڕاستەکەیانە؟ وە چۆن بزانیننن ئەو تەریقەیان ڕاستە؟ بە چی پێوەرێك هەڵیسەنگێنین؟ تەمەنیش کورتە، پێڕاناگەین لێکۆڵینەوە لە هەزارەها تەریقە بکەین لە جیهاندا، هەتا ببین بە شوێنکەوتووی ئەو تەریقەیە؟ زۆر کەسیش هەن نەخوێندەوارن چۆن لێکۆڵینەوە بکەن؟ من وای بە باش دەزانم ساتێکیش ئێمە دەست بە چاومانەوە بگرین وەك ئەوان و بچینە جیهانی سوفیزمەوە و چەند تەریقەیەکیان ببینین، بزانینن دنیا بەرەو کوێوە دەچێت؟ جیهانی ئەوان چی تێدایە؟ پاش ئەوەی ئەوانەمان بینی، هەقی خۆمانە پرسیار بکەین: لە یەکەم ڕۆژی وەحییەوە ئاینیی ئیسلام هیچ لەمانەی تێدا بووە؟ پێغەمبەر ﷺ و سەحابەکان (ڕەزای خوای گەورەیان لێ بێت) کام تەریقەتەیان هەبووە؟! ئەگەر ئەوە ئایینی ئیسلام بێت، یاسا و ڕێساکانی لەکوێدایە؟ چۆن بتوانینن کاروباری دینی و دنیاییمان بەڕێوە ببەین و لەسەر بنەمای کام تەریقەتەیان؟ ئەگەر ئایینی ئیسلام بەو شێوەیە بوایە، دونیا بەرەو کوێ دەچوو؟

چونکە تەریقەتەکانی سۆفیزم هەریەکە و بەگوێرەی کەراماتی شێخەکانیان تەفسیری قورئان و حەدیسەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، قورگم خەریکە وشك دەبێت، ناتوانم هیچ بڵێم؛ ناتوانم هاوار بکەم نازانم چی بڵێم؟ وا بزانم دەتوانم جووڵەیەکی کەم بکەم. (الحمد لله) جووڵام لەجێی خۆم، بەڵام هەموو گیانم تەڕ ببوو لە عارەقدا.

بەخەبەر هاتم لەو کابووسە و شوکری خودام کرد، تەنانەت ئەو چەند ساتانەشم بە خەیاڵیشدا نەهاتبوو وەك دەروێشێك بژیم یان بیر بکەمەوە. ئەو خەونە و ئەو کابووسە ئەوەندە گران بوو لەلام، دەستەکانم هەر لەسەر چاوانم بوون بەپەلە لامدان و ئەم ئایەتە هاتەوە بیرم: (قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّـهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّـهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ). وە شوکری خوداشم کرد بەدوای هەزارەها تەریقەدا ناگەڕێم بۆ ئەوەی شێخەکەم ڕێنماییم بکات، چونکە: (إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّـهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ).

ئەی ئەو کەسەی خۆت کردوە بە دەروێش و سۆفی، تا کەی جەنابیشت لە جیهانی منداڵیدا دەژیت و دەستت هەر لەسەر چاوەکانتە؟! لات وایە لەسایەی شێخەکەتدا و لەڕێی تەریقەکەیەوە بەرەو بەهەشت دەڕۆیت؟! ئایا گەورە نەبوویت و نازانیت کە خودای (السميع البصير) دەتبینێت؟! ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دەست لەسەر چاوەکانت لادەیت و بەرزیان بکەیتەوە بۆ (القريب السميع المجيب) و تۆبە بکەیت و داوای ئیرشاد و نەسیحەت و تەریقەتی (اهدنا الصراط المستقيم) لە خوداکەت بکەیت نەك لە شێخەکەت؟!

## الشمس التبريزى گومڕا بناسە

ناوی ( شمس الدين التبريزي محمد بن ملك داد التبريزي) يە ، لە تەبرێز لە ساڵی ٥٨٢ ی کۆچی بەرانبەر ١١٨٥میلادی لە دایکبووە، شاعیرێکی فارسە بە قوتب و سۆفی گەورەو عاریف و خاوەنی عیشقی ئیلاهی! دەناسرێت، مامۆستای ڕۆحی و هاوڕێی گیان بە گیانی جلال الدين الرومى بووە ،کە توانی گۆڕانکارییەکی گەورە لە ژیانی جەلالدا درووست بکات لە زانایەکی ئاساییەوە بیکاتە شاعیر و سۆفییەکی خاوەن تەریقەت .

هەر لە تەمەنی دە ساڵانەوە – وەکو دەگێڕنەوە – خەونی زۆر دەبینی، بەڵام باوکی باوەڕی پێ نەدەکرد، بۆیەماڵی بە جێهێشت و دەڵێن هەرگیز زیاتر لە شەوێك لە جێگەیەکدا نەدەمایەوە و هەردەم جێگای دەگۆڕی، ئەو دەیوت لە خەونەکانیدا خواو مەلائیکەتەکان دەبینێ، پارەی بۆ بژێوی خۆیشی بە لێکدانەوەی خەونەکان و خوێندنەوەی ناو لەپ بۆ خەڵکی پەیدا دەکرد ، لە لای خەڵکی بە دێوانەو شێت دەناسرا.

لە گەشتە بەردەوامەکانیدا گەیشتە شاری قۆنیە و لەوێ لەگەڵ جلال الدینی ڕۆمیدا یەکتریان ناسی و چەند ساڵێك پێکەوە بوون بۆ ماوەی چل ڕۆژ پێکەوە چوونە خەلوەتگا و لە ئەنجامدا چل بنەمایان بۆ عیشقی ئیلاهی! درووست کرد، دواتر لە بارودۆخێکی تەمومژاویدا شەمس بەرەو دیمەشق هەڵهات و پاش ماوەیەك بە هەوڵی جەلال و ناردنی کورەکەی بە دوایدا بۆ دیمەشق دیسان گەڕایەوە بۆ قۆنیە و پێشوازییەکی شکۆداریان بۆ ئامادەکرد وبەڵام دواجار لەوێ هەندێ لە نەیارەکانی بە کوشتن کۆتاییان بە ژیانی شەمس هێنا لە ساڵی ٦٤٥ی کۆچی بەرانبەر ١٢٤٨ی میلادی وگۆڕەکەی ئێستا لە شاری خوی ئێرانە و پێشنیاز کراوە بکرێتە یەکێك لە شوێنەوارە کلتوریە جیهانیەکان ی سەر بە یونسکۆ.

وەکو باسمان کرد شەمس هەر لە سەرەتای ژیانیەوە کەسێکی ئاسایی نەبوو، کاتێك مامۆستا بوو لە (أرضروم) بە شێوەیەکە دڕندانە لە خوێندارەکانی دەدا و خوێن بە دەست و قاچیاندا دەهاتە خوارەوە وە کو (الأفلاکي) لە مناقب العارفین دا دەگێڕێتەوە .

لە زانستی کیمیا – نەك بە واتای کیمیای ئەم سەردەمەی خۆمان بەڵکو زیاتر بە واتای سیحرو جادوو کردن - شتی سەیرو سەمەرەی لێ بەدیدەکرا ، جارێك لە لای جەلالدا کتێبێکی خستە ناو ئاوێکەوە و تەڕ نەبوو، جەلال دەیوت: زانایانی زاهیربین تەنها شارەزای فەرموودەکانی پێغەمبەرن ﷺ بەڵام سەرگەورەمان (مەبەستی شەمس بوو) لە نهێنییەکانی پێغەمبەرمان شارەزایە و منیش ڕووناکییەکانی دەخەمەڕوو.

لە هەردووکیانەوە قسەو باس و بانگەشەی گەورە دەربارەی توانایان و پەیوەندییان بە خواو تایبەتمەندییان لە مەسەلەی دینداری زۆر شتی سەیر دەگێڕنەوە، کە هەندێکیان الأفلاکی مێژوونوس و سپهسالاری مێژوونووس باسیان کردووە، لەوانە: شەمس دەیوت ئەگەر جنێو بە کافرێك بدەم سەد ساڵ کافر بووبێت دەبێتە ئیماندار، ئەگەر جنیویش بە ئیماندارێك بدەم دەبیتە ئەولیا و دەچێتە بەهەشتەوە، کەسێکیش لێی پرسی ئیبلیس کێیە؟ پێی وت تۆ ئیبلیسی! ..

ئەگەر پرسیارت بکردایە جیبریل کێیە دەموت تۆ جیبریل ی ! هەروەها دەیوت: مورید لە سێ ڕێگەوە دەگاتە لامان: بە مال و بە حاڵ و بە ئیبتیهال! واتە: بە پارەو حاڵ و پاڕانەوە! هەروەها دەیوت: تاکو کەی تەنها باسی ئایەت و فەرموودە دەکەن و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دڵتان لە خوا شت ناگێڕێتەوە!

الأفلاکی دەگێڕێتەوە جارێکیان شەمس سەماعی دەکرد واتە:گوێی لە گۆرانی دەگرت، کەسێك وتی بڕوانە دەروێشەو گوێ لە مۆسیقا دەگرێت! شەمس وتی: دەك نەبینیت و نەبیسیت ئیتر ئەویش دەست بە جێ کوێرو کەڕ بوو ! چەندیش تکایان کرد بێ سوود بوو کە لێی خۆش بێت!

جارێکی تریش لە کەسێکی تر تووڕە بوو ئەویش کوێرو کەڕ بوو! بەڵام دواتر لێی خۆش بوو و چاك بوویەوە! شەمسی تەبریزی دەربارەی جەلالی ڕۆمی دەیوت: هەرکێ دەیەوێت پێغەمبەر ﷺ ببینێت با تەماشای جەلال بکات بەهەشت لە ڕازیبوونی ئەودایەو دۆزەخ لە تووڕەبوویدایە ، سەرگەورەمان جەلال کلیلی بەهەشتە!

ئەمە چەند بەسەر هاتێکی کەم بوو لەوانەی لە مەناقیبی شەمس باسکراوە کە دەشێت بۆ باسکردن، هاوکات زۆر هەواڵی تر دەگێڕنەوە دەربارەی پەیوەندی ئەو بە ئافرەت و مناڵی جوان و گەنجی موو لێنەهاتوو و عارەق و تریاق خواردن..هەرگیز شیاوی باس کردن نین، خوێنەر خۆی دەتوانیت لە هەواڵەکانی الأفلاکی و سپهسالارو کتێبە کەی أبو الفضل القونوي (أخبار جلال الدين الرومي) خۆی بیخوێنێتەوە.

بۆیە کاتێك جەلالی ڕۆمی کوڕە تازە پێگەیشتووەکەی خۆی بە شەمسی تەبریزی پێشکەشکرد لەوانەیە بۆ خزمەتکردن بێت، لە نێو خەڵکدا لە قۆنیە وتی وتی پەیدا بوو، بۆیە جەلال ناچار بوو گومانی خراپ لە کوڕەکەی دوور بخاتەوەو بڵێت: بەهادینی کوڕم هەرگیز نە حەشیشە ئەخوات و نە کاری قەومی لوط ەنجام دەدات!

شەمس کێشەیەکی گەورەی تری هەبوو ئەویش ئەوە بوو بە کرێگرتەی مەغۆلەکان بوو، بۆیە خەڵکێکی زۆر بە تایبەتی دانیشتوانی قۆنیە ڕقیان لێ بوو، بەپێی ئەوەی مێژوونووسە

تورکەکان ئاماژەیان پێکردووەو نووسەری کتێبی (أخبار جلال الدين الرومي) دەیگێڕێتەوە کوڕێکی جەلال لە گەڵ خەڵکی قۆنیە بەشدار بوون لە کوشتنی شەمسی تەبرێزیدا، هەندێکیش پێیان وایە وەکو بە ئەفسانەکردنی کوشتنەکەی کە ئەو دیار نەماوەو چووە بۆ شاری (خوی) و هەر لەوێش مردووەو نێژراوە!

لە پاش کوژرانی شەمس ئیتر جەلال کەوتە خراپترین بارودۆخەوەو بەردەوام دەهات و دەڕۆیشت و ئارامی لێ بڕابوو، دواتر مێزەرێکی خۆڵەمێشی ، یان وەکو ڕەنگی دووکەڵ پێچایە سەری و جۆرە جل و بەرگێکی تایبەتی پۆشی تا کۆتایی تەمەنی هەر بەو شێوە مایەوە.

## دەست بە ئەصلی دینەکەتەوە بگرە و واز لە گروپ و حیزب و جەماعەتی باطڵ بهێنە:

پرسیار کرا لە ابن عەباس واتە عبداللەی کوڕی عەباس (رضي الله عنهما): وتیان تۆ لەسەر میلەتی عەلی یان لەسەر میلەتی عوثمانی ؟ فەرمووی: من نە لەسەر میلەتی عەلیم و نە لەسەر میلەتی عوثمانم بەڵکو لەسەر میلەتی "رسول الله"م ﷺ.[١٦]

ئەی ئێوە ئێستا لەسەر میلەت و بەرنامە و ڕێبازی کێن ؟

ئەوە کۆمەڵە ئەوەیان سۆفی بزووتنەوە ئەوەیان یەکگرتووە ئەوی تر مەدخەلی ئەوی تر ئەوانی تر عەلمانی ...!

ئەم حیزب حیزبێنە و گروپ گروپێنەتان لە کوێ هێنا ؟

---

[١٦] - کتاب_الابانة "(١/٢٥١)

## تاوانی هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە.!

بێگومان هەموو پێغەمبەران (على نبينا وعليهم الصلاة والسلام) بۆ مەبەستێکی سەرەکی هاتوون ئەویش ناسینی خوایە بەتەنهاو دوور لە شەریک و هاوەڵدانان بۆی، بێگومان هەرکەس بەهەرشێوەیەک لە شێوەکان کەسێک یا شتێک بخاتە ئاستی خوا، لە پەرستن و خۆسەویستی و رێزگرتن و هاوارلێکردن و داوا لێکردن و پشت پێ بەستن و .... ئەوە شەریکی بۆ خوا داناوەو سزاکەی چونە دۆزەخە بە ئەبەدی و لێبوردنی خوای گەورە نایگرێتەوە، هەرکەسیش رازیبێ بەوە کە خەڵک لە ئاستی خۆی زیاتر رێزی لێ بگیرێ و بەرز بکرێتەوە خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام دەکات بە ئەبەدی و بەرووەوام لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە،

[وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ][١٧]

[١٧] -( المائدة آية ١١٦)

واتە: کاتێک خوا لە دوارۆژدا دەفەرموێ: ئەی عیسای کوڕی مەریەم تۆ بە خەڵکت وتووە من و دایکم بە دوو پەرستراو دابنێن لە جیاتی خوا؟ عیسا دەڵێ: پاک و بێگەردی بۆتۆ ناکرێ و ناگونجێ من شتی وابڵێم، من مافی ئەوەم نیە، ئەو قسە بکەم.

بەراستی [إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا][١٨]

واتە: بێگومان خوا خۆش نابێ ئەگەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، لە هەرتاوانێکی تر جگە لەهاوبەش دانان خۆش دەبێ بۆ هەرکەس بیەوێ، هەرکەس هابەش بۆ خوا دانێ بەڕاستی درۆو تاوانێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

قال تعالى: (إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ)[١٩] واتە: بێگومان هەرکەس شەریک بۆ خوا

---

[١٨] -(النساء، الآية: ٤٨).
[١٩] -(المائدة: ٧٢).

دابنێ خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات و شوێنی دۆزەخ دەبێ، ستەمکاران هیچ یارمەتی دەرێکیان نیە.

(مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ)[٢٠]

واتە: پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی باوەڕدارن ڕەواو شایستە نیە داوای لێخۆش بوون بۆ هاوبەش دانەران بکەن، با خزمی نزیکیشیان بێ، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە ئەوانە بێگومان هاوەڵ و پێڕی دۆرەخن.

[قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ)[٢١]

واتە: ئەی محمد ﷺ بڵێ ئەمە ڕێگای منە بانگی خەڵکی دەکەم بۆلای خوا، لەسەر بەڵگەی ڕۆشن، من و ئەوانەش کە شوێنم کەوتوون، خواش پاک و بێگەردە، من هەرگیز لە هاوبەش دانەران نیم.

٢٠ - التوبة، الآية: ١١٣)]

٢١ -[يوسف:١٠٨].

## سەرەتای پەیدابوونی شیرک و هۆکاری کافربونی نەوەی ئادەم:

بێگومان هۆی کافربونی نەوەی ئادەم و دورکەوتنەویان لە ئایینەکەیان و زیادەڕۆیی کردنیان بوو لە مەدح و پیاهەڵدان و بەرز ڕاگرتنی پیاوچاکانیان بە شێویەکی ڕادە بەدەر،
ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا لەبارەی ئایەتی: [وَقَالُوا لا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلا سُوَاعًا وَلا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا][٢٢] دەڵێ: ئیبن عەباس لەوبارەوە وتویەتی: ئەمانە ناوی پیاوچاکانی گەلی نوح بوون کاتێک مردن شەیتان بە قەومەکەیانی وت: لە شوێن و دانیشتنی ئەو پیاو چاکانەتان پەیکەر دروستکەن و ناوی ئەوانی لێ بنێن، ئەوانیش بەو جۆرەیان کردو نەیان دەپەرستن هەتا ئەو جیلە نەمان نەوەکانی دوای ئەوان یەکتاپەرستیان لەبیرکردو پەرستیانن..
(ئیبن قەیم دەفەرموێ: سەرەتا خەڵک دەچوون لەسەر گۆڕەکانیان دەمانەوە پاشان وێنەیان کێشان و پەیکەریان بۆ دروست کردن و

---

[٢٢] ـ٢٣ نوح

پاشان دەستیان دایە پەرستنی پەیکەرەکان) بەو شێوە شیرک و بت پەرستی پەیدابوو، ئیتر ئەو پەرستنە جیل لەدوای بەردەوام بوو.

خوای گەورە دەفەرموێ: [قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلا تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيرًا وَضَلُّوا عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ][٢٣]

واتە: ئەی محمد ﷺ بەگاورەکان بڵێ زیادەرەوی لە ئایینەکەتاندا مەکەن بە ناڕەوایی - مەڵێن عیسا خوایە یا کوڕی خوایە - شوێن هەواو ئارەزووی گەلانی پێش خۆتان مەکەون کە خۆیان گومڕا بوون و خەڵکێکی زۆریشیان گومڕاکردو لەسەر راستە رێگاکە لایانداو دوورکەوتنەوە.

بەداخەوە لەنێو ئومەتی ئیسلامدا چەند سەدەیەکە چونە سەر گۆڕی پیاوچاکان و پەرستن و هاوارو پارانەوە لێیان تەنەشەی کردووە، دەچن بۆ مناڵ و کوڕو چاک کردنەوەی و نەخۆش و بەختی باش و

٢٣ -(المائدة: ٧٧)

نەمانی ترس و چەندین شتی تر داوا لە خاوەنی ئەو قەبرانە دەکەن، لەکاتێکدا خوای گەورە لە چەندین ئایەت و پێغەمبەر ﷺ لە چەندین فەرموودەدا پێیان ڕاگەیاندوین ئەوە کارێکی ناڕەوایەو دەبێتە شیرک هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە، هەرکەس لەسەری بەردەوامبێ و تەوبەی لێنەکات گەورەترین زەرەرمەندی دونیا دوارِۆژ دەبێ، زۆر بەداخەوە چەندین کەس بەهۆی بێ ئاگاییانەوە، یا لەبەر پەرژەوەندی خۆیان بەرگری لەو کارە دەکەن و بەکارێکی باشی دەزانن و چەندین بڕوبیانووی ناڕەوا دەهێننەوە بۆ دروستی ئەوکارە.

خوای گەورە دەفەرموێ: [قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللَّهِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ]

ئایا ئێوە باشتر دەزانن یا خوای زاناو کاربەجێ.؟

## شەریک دانان بۆ خودا ژیانی دونیاو دوارۆژت لەناو دەبات.

بێگومان بابەتی شەریک دانان بۆ خوا دانان کە ترسناکترین و گەورەترین تاوانە پێویستە هەموو تاکێکی موسڵمان وریابێ و گرنگی پێ بدات و شارەزایی هەبێ و بترسێ بکەوێتە ناوی، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لە خوا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لاَ أَعْلَمُ)

بەسوک سەیرکردن و چاوپۆشی کردن لەهەر جۆرێک لە جۆرەکانی شیرک کارێکی زۆرناڕەوایەو توشی گەورەترین بەرپرسیارێتی بەردەم خوای گەورە دەبین، خوای گەورە خۆی لەهەمووکەس باشتر دەزانێ و بڕیاری تەواو لەلای خوای گەورەیەو ئێمە بۆمان نیە بەهەر ناوو بیانویەکەوە، جۆرێک لە جۆرەکانی شیرک لای خەڵک ئاسان بکەین.

چونکە شەریک دانان بۆ خوای گەورە گەورەترین تاوانێکە کە بە هیچ شێوەیەک لێخۆشبوونی خوا نایگرێتەوە، (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ) مەگەر کەسێک تەوبە بکات و داوای لێخۆش بوون لە خوای گەورە بکات پێش ئەوەی مردن یەخەی بگرێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ألاَ أُنبِّئكم بأكبرِ الكبائر؟ الإشراك بالله)[٢٤].

ئایە پێتان بڵێم گەورەترین تاوان چیە، شەریک دانانە بۆ خوای گەورە.

لە فەرموودەی قودسیدا خوای گەورە دەفەرموێ: (أنا أغْنَى الشُّركاءِ عنِ الشِّرك، مَنْ عملَ عملاً أشركَ فيه معِيَ تركتُهُ وشِركَهُ) من دەوڵەمەندترین و بێنیازترین زاتێکم شەریکم بۆ دانراوەو پێویستم بە شەریکایەتی نیە، جا هەرکەسێک کارێک بکات و لەکارەکەیدا کەسێک بکاتە شەریکم ئەوە وازدەهێنم لە خۆیی و کارەکەشی لێ وەرناگرم.

---

[٢٤] - متفق عليه

بێگومان شەریک دانان بۆ خوا دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: شەریکی گەورەیە، وەک پەرستنی غەیری خوا، یا بەجێ هێنانی بەشێک لە جۆرەکانی پەرستن بۆ غەیری خوای گەورە.
جۆری دووەم: شیرکی بچوکە، وەک ریاو روپامایی.

ان شاء الله لەچەند بەشێکدا بەشێوەیەکی کورت و پوخت باسی جۆرەکانی شیرک دەکەین.

## چوون بۆ سەر گۆڕی پیاوچاکان.

بێگومان شیرک چەند بەشێکە:

بەشی یەکەم: چوون بۆسەر گۆڕی پیاوچاکان.

بەباشم زانی لە بەشی یەکەمدا باسی چونە سەر گۆڕی پیاوچاکان بکەم چونکە یەکەم شیرکێک کە لەسەر زەوی دروست بوو لەو رێگەوە دروست بوو بەردەوامیش لەنێو هەموو گەلەکاندا سەری هەڵداوەتەوە، زۆر بەداخەوە ئەم جۆرە لە شیرک بەناو ئایینەوە دەکرێ و وادەخرێتە بەرچاو خەڵک خواو پێغەمبەرو پیاوچاکان بەوکارە رازین و کێشەی نیە.

بەڵام لە راستیدا ئەوکارە دژو پێچەوانەی چەندین ئایەت و فەرموودەیەو لەگەڵ یەک خوا پەرستیدا یەک ناگرێتەوە

سەرەتا دەبێ ئەوەمان لا روونبێ چوون بۆ سەر گۆڕستان دوو جۆرە، جۆری یەکەم سەردانی گۆڕستانە بۆ دەرس و ئامۆژگاری وەرگرتن و

بیر کردنەوە لە مردن و دوعای خێر بۆ مردوەکان، ئەم جۆرە سەردانە دروستەو بەڵکو خێرو چاکە ئەگەر حەرامی تێکەڵ نەبێ.
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا؛ فَإِنَّ فِي زِيَارَتِهَا تَذْكِرَةً)[٢٥]

جۆری دووەم: چوون بۆ سەرگۆڕی پیاوچاکان (بەمەبەستی) پاڕانەوە لێیان و پشت بەستن پێیان و سەربڕینی حەیوان لەسەر گۆرەکەو نوێژکردن لە نزیک گۆرەکەو خەوتن لەسەر گۆڕەکەو چەندین شتی تر، ئەم جۆرە سەردانە بێگومان شەریک دانانە بۆ خوا، ئەگەر کەسێک بڵێ خۆ ئێمە نایان پەرستین ئەمانە پیاوچاکن و لای خوا تکامان بۆ دەکەن، ئێمەش دەڵێین کافرو موشریکەکانی کاتی پێغەمبەریش هەر ئەو قسانەیان دەکرد..

[٢٥] - سنن ابو داود صحيح.

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ سبحانه وتعالى عَمَّا يُشْرِكُونَ)[٢٦] . لەباتی خوا شتانێک دەپەرستن نە دەتوانن زیانیان پێ بگەیەنن نە دەتوانن سودیان پێ بگەیەنن، دەڵێن ئەوانە لای خوا تکامان بۆ دەکەن، بڵێ ئاخۆ خەبەر بە خوا ئەدەن بە شەریکێک لە ئاسمانەکان و زەوی خۆی پێی نەزانێ، پاک و بێگەردی و بەرزو بڵندی لە هەرشتێک بێ باوەڕان دەیکەنە شەریک و هاوبەشی خوای گەورە.

خوای گەورە دەفەرموێ: [فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ (٢) أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ][٢٧] جا خوا بپەرستن بە پوختی، ئاینداری هەر بۆ ئەوە، ئاگاداربن ئایینی پاک و بێگەرد بۆ خوایە، ئەوانەی کە لەباتی خوا

---

[٢٦] - يونس: ١٨
[٢٧] - الزمر (٣)

چەند گەرەو دۆستێکیان بۆ خۆیان داناوەو ئەڵێن: ئێمە بۆ ئەوە ئەم دۆستانە دەپەرستین تا لە خوامان نزیک بکەنەوەو تکامان بۆ بکەن. بێگومان ئەوکەسانەی کە ئێستا دەچنە سەر گۆڕی ئەو پیاو چاکانە ئەگەر پێیان بڵێی بۆ دەچن دەڵێن ئەمانە پیاوچاکن و دەمانەوێ لای خوا تکامان بۆ بکەن.

تێبینی/ دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ زیاد حەفتا لە سەدی ئەوانەی خەڵک دەچێتە سەر گورەکەی و دەڵێن پیاوچاکە بنەچەی دیارنیەو کەسیش نازانێ ئەم پیاو چاکە چۆن گەشتۆتە ئەو شوێنە، تەنها چیرۆکێکی ژیانی خەیاڵاوی بۆ دروست کراوە.
ماویەتی..

## تاوانی هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە.!

ئایا ئەو مەزارگانە توانای سوود گەیاندنیان هەیە؟

بێگومان هیچ ئەولیاو پیاو چاکێک لە گۆڕەکەیدا ناتوانێ زەرەرو قازانجت پێ بگەیەنێ.

عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ الله ﷺ يَوْماً، فَقَالَ: يَا غُلامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ: احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِالله، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ، إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ، إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلامُ، وَجَفَّتِ الصُّحُفُ)[٢٨] عبداللەی کوڕی عەباس خوای لە هەردوکیان رازی بێ دەڵێ: ڕۆژێک لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ سوار بوو بووم، فەرمووی: ئەی ڕۆڵە! چەند وشەیەکت فێر دەکەم: سنورەکانی شەرعی خوا بپارێزە، خوا لە

[٢٨] - صحيح رواه الترمذي

ناسۆری و نارەحەتیەکانی دونیاو دوارۆژ دەتپارێزێ، سنورەکانی شەرعی خوا بپارێزە خوا دەبینیت لە پێشتەوە لەگەڵتدا دەبێت، ئەگەر داوات کرد ئەوە تەنها داوا لە خوا بـکە، وە ئەگەر داوای یارمەتیت کرد ئەوە تەنها داوای یارمەتی لە خوا بکە، وە بزانە ئەگەر ئوممەت هەموو (مرۆڤەکان) کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن بە شتێک ناتوانن سوودت پێ بگەیەنن مەگەر خوا بۆی نوسیبی، وە بزانە ئەگەر هەموو مرۆڤەکان کۆببنەوە زیانێکت پێ بگەیەنن بە شتێک ناتوانن ئەو زیانەت پێ بگەیەنن، مەگەر خوا نوسیبێتی بەسەرت بێ، پێنووسەکان هەڵگیراون، وە لاپەڕەکانیش وشک بوونەوە.

[قُلْ لا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلا ضَرّاً إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنْتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ][٢٩] خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بڵێ من خاوەنی هیچ زیان و سودێک نیم بۆ خۆم، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، ئەگەر

---

[٢٩] ـ الاعراف آية ١٨٨

من نادیارەکانم بزانیایە، خێرو خۆشی زۆرم بۆ خۆم دەهێنا، وەهیچ خراپەو زیانێکم پێ نەدەگەیشت، من تەنها ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ خەڵکانێک کە باوەڕ دێنن.

[قُلْ إِنيِّ لا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرّاً وَلا رَشَداً][٣٠] خوای گەورە دەفەرموێ بڵێ: من نە زیان نە ڕێنوێنی ئێوەم بەدەست نیە.

[وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ][٣١] ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەر بە فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەر کام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەمەندی دەکات، ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.

---

[٣٠] - الجن آية ٢١
[٣١] - يونس - الآية ١٠٧

بەڕێزان لە فەرمودەکەدا پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوە ڕاستەوخۆ داوامان لێدەکات هەر داواکاری و پێویستیەکمان هەبوو تەنها داوا لە خوا بکەین، و داوا لەکەسی تر نەکەین دەفەرموێ: ئەگەر هەموو خەڵک بەیەکەوە بیانەوێ سودێکت پێ بگەیەنن یا زیانێکت لێ دەن ناتوانن مەگەر خوا ویستی هەبێ.

لە ئایەتەکانیشدا خوا ئاگادارمان دەکاتەوە کە پێغەمبەر ﷺ توانای سودو زیانی بۆ خۆیی و خەڵکیش نیە، باشە پێم ناڵێن بەچ عەقڵێک و لۆژیکێک پیاو چاکێک لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دوای مردنەکەی لە گۆڕەکەیدا دەسەڵاتی لە پێشەواکەی زیاتربێ و بتوانێ زیان یا سود بە خەڵک بگەیەنێ، باشە ئەو باوەڕە دژایەتی قورئان و فەرمووەی سەحیح نیە؟

ئومێدەوارم بەخۆماندا بچینەوە گوێ لە ئایەت و فەرموودەکان بگرین و خۆمان و خەڵکی داماویش نەخەڵەتێنین ئەوەی تا ئێستا نەیزانیوە ئێستا دەیبیستێ با بەخۆیدا بچێتەوە.

## ڕێزو حورمەت لە پیاوچاکان و ئەولیاکان واجیبی سەرشانی موسوڵمانانە.!

- سەردانی گۆڕی پیاوچاکان بەمەبەستی پەند وەرگرتن و دوعا بۆیان سوننەتە.!

بەڕێزان وخۆشەویستان، بێگومان خۆشویستن و ڕێزگرتنی زانایان و پیاوچاکان و خواناسان واجب و پێویستە لەسەر موسڵمانان، بێرێزی کردن پێیان و باسکردنیان بە شێوەی ناشرین و ناڕەوا کارێکی حەرام و نەشیاوەو ڕێگە بەکەس نەدراوە بێ ئەدەبی بەرانبەر خۆیان و گۆڕەکەشیان بکات، سەردانی گۆڕەکەیان و دوعاکردن بۆیان و وەرگرتنی دەرس و ئامۆژگاری دروستەو پاداشتی لەسەر وەردەگرین، بەڵام زیادەڕەوی لە خۆشەویستی و ڕێزدا بۆیان کارێکی ناشەرعیەو خواو پێغەمبەر حەرامیان کردووە، ئەوەتا گەورەترین و بەڕێزترین و خۆشەویسترین و چاکترین بەندەو پێغەمبەری خوا کە دڵسۆزترین کەسە بۆ ئێمەی موسڵمان ئامۆژگاریمان دەکات و پێمان رادەگەیەنێ

ئاگاداربین لە رچەو رێبازە راستەکە لانەدەین و زیادەرەوی لە ئایین و خۆشەویستی پێغەمبەردا نەکەین و نەیگەیەنینە ئاستی خوای گەورەو بیپەرستین.

خوای گەورە دەفەرموێ: [لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ][٣٢]

واتە: سوێند بەخوا پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە کە لە خۆتانە، بەلایەوە سەختە هەرشتێ ئێوە بخاتە نارەحەتیەوە، سورە لەسەر هیدایەت و قازانجی ئێوە لە دونیاو دوارۆژدا، بۆ باوەڕداران بە بەزەیی و بەرەحمە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانمان پێ دەکات و دەفەرموێ: (ولا تجعلوا قبري عيدا، وصلوا علي فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم)[٣٣] واتە: گۆڕەکەم مەکەنە شوێنی کۆبوونەوەو یادەوەریتان، لە هەرشوێنێک بوون سەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە لە هەرشوێنێک بن سەڵاواتەکانی ئێوەم پێدەگات.

---

[٣٢] - ١٢٨ التوبە
[٣٣] - رواه ابوداود،

(عەلی کوڕی حسین - ناسراو بە زەین العابدین - پیاوێکی بینی کە زوو زوو دەهات سەری دەکرد بە دەلاقەیەکدا، لای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد، عەلی نەهی لێکردو وتی: ئایە فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە باوکم بۆمنی گێڕاوەتەوە ئەویش لە باپیرە عەلیمەوە بیستویەتی فەرموودەکەی پێشووی بۆ گێڕایەوە) فەرموودەکە ئەبوداود بە سەنەدی حەسەن هێناویەتی.

ئەوەتا لەم فەرموودەدا عەلی کوڕی ئیمام حسین بەراست و رەوان نەهی لەو پیاوە دەکات کە دەچێ لە نزیک گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دوعا دەکات و پێی دەڵێ پێغەمبەر خۆی رێگری لەوکارە کردووە.

لە فەرموودەی تردا هاتووە (لا تطرُوني كما أطرتِ النصارَى ابنَ مريمَ إنما أنا عبدٌ فقولوا عبدُ اللهِ ورسولُه)[٣٤]

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لە مەدح و پیاهەڵدانی مندا زیادەرەوی مەکەن، وەک گاورەکان کە لەبارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە

---

[٣٤] - اخرجه البخاري

زیادەڕەویان کرد، من تەنها بەندەیەکم، پێم بڵێن بەندەی خواو پێغەمبەری خوا.

هەرواها دەفەرموێ: (إياكم والغُلُوَّ؛ فإنما أهلك من كان قبلكم الغُلُوُّ) وریای زیادەڕەویبن، ئاگاتان لەخۆتانبێ نەکەونە زیادەڕەویەوە، چونکە گەلەکانی پێش ئێوە تەنها بەهۆی زیادەڕەویەوە لەناوچوون.

ئەمانە فەرموودەی پێغەمبەرن ﷺ ئاگاداربن نەکەن قسەی کەس پێش قسەی پێغەمبەر ﷺ بخەن، ئەوکاتە بێ فەرمانی ئەم ئایەتەی خوای گەورەت کردووە کە دەفەرموێ: [يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ] زانایان دەفەرموون واتە قسەو فەرمانی کەس پێش قسەو فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ مەخەن.

## دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕی پیاوچاکان.!

ئوم حەبیبەو ئوم سەلەمە لای پێغەمبەر ﷺ باسی کەنیسەیەکیان کرد لە حەبەشە کە بینیویانە وێنەی تیابووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، فَأُولَئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَومَ القِيَامَةِ)[٣٥] واتە: ئەوانە ئەگەر پیاو چاکێکیان هەبوایەو بمردایە لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتیان دروست دەکرد، وێنەی ئەو پیاو چاکانەیان لەسەر دیوارەکەی دروست دەکرد، ئەوانە لە دورۆژدا خراپترین دروستکراون لای خوای گەورە.

پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشی سەرەمەرگدا فەرمووی: (أَلَا وَإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ، أَلَا فَلَا تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ، إِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ)[٣٦]. واتە: وریابن بێگومان

---

[٣٥] - اخرجه البخاري
[٣٦] - رواه مسلم

ئەو گەلانەی پێش ئێوە بوون، دەچوون مزگەوتیان لەسەر گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکانی گەلەکەیان دروست دەکرد، ئاگاداربن لەسەر گۆرەکان مزگەوت دروست مەکەن، من ڕێگری ئەوکارەتان لێ دەکەم.

پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: [لعن الله اليهود والنصارى، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[٣٧] واتە: دووربن لە ڕەحمەتی خوا جوو گاور، دەچوون گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکرد بە مزگەوت.

پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (اللهم لا تجعل قبري وثناً يعبد، اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد) واتە: ئەی پەرستراوم گۆڕەکەم نەبێتە بتێک و بپەرسترێ، غەزەب و توڕەیی خوا زیادی کرد لەسەر ئەوگەلەی گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت

---

٣٧ - رواه مسلم

{فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ}[38]

خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاگادارمان دەکاتەوەو دەمان ترسێنێ نەکا بکەوینە هەڵەی کوشندەو شوێن قال و قیل بکەوین و موخالەفەی فەرمانەکانی پێغەمبەر بکەین، ئەگەر وابکەین توشی بەڵاو نەهامەتی دەبین یا توشی سزای بە ئێش دەبین.

بێگومان ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نەخۆشی مردنەکەیدا فەرموویەتی: زۆر خەمی ئەوەی بووە گەلەکەی دوای خۆی توشی گومڕایی و شیرک هاوەڵدانان بن، با ئێمەش هەوڵ بدەین خۆمان لەو شتانە بەدوور بگرین کە توشی شیرکمان دەکات بەڵکو لەوانەش خۆمان دوور خەینەوە کە شوبهەو گومانی تێدایە.

[38] ـ النور:٦٣).

با بەکورتی ئاماژە بە قسەی زانایان لەسەر ئەم فەموودانە بکەین، بە ئیتیفاقی هەر چوار مەزهەبەکە حەرامە مزگەوت لەسەر گۆڕ دروستبکرێ، پێچەوانەکەشی هەروایە.

١ - مەزهەبی شافیعی:

شەرعزانی ناوداری مەزهەبی شافیعی ئیبن حەجەری هەیتەمی لە (الكتاب الزواجر عن اقتراف الكبائر)دا دەڵێ تاوانی گەورەی نەوەدو سێ و چوارو پێنج و شەش و حەوت و هەشت، بریتیە لە دروستکردنی مزگەوت لای گۆڕ ، هەڵکردنی چرا لەسەری و کردنی گۆڕ بە بت و تەواف کردن بەدەوریداو دەست لێدانی و نوێژ کردن بەرەو رووی گوڕ، پاشان چەندین فەرموودە دێنێ بۆ پشتگیری قسەکانی، پاشان دەڵێ: ئەم شەش کردارە لە گوناحە گەورەکانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی کردووە لەو گەلانەی گۆڕی پێغەمبەرەکەیان کردۆتە مزگەوت، وە ئەوکەسانەی لەسەر گۆڕی پیاوچاکان مزگەوت دروست دەکەن، بەخراپترین دروستکراو لای خوا لە رۆژی دوایی لەقەڵەمی

داون، ئەو فەرموودە ترساندنی ئێمەی تێدایە لە روایەتی تردا (يُحذِّر مثل الذي صنعوا) واتە: عائیشە دایکی موسڵمانان رەزای خوای لێ بێ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ گەلەکەی ئاگادارکردۆتەوە نەکا وەک گەلەکانی پێشتوتر بکەن و توشی لەعنەت بن وەک چۆن گەلەکانی پێشوو توشی لەعنەت بوون، لەبەر ئەوە هاوەڵانی ئێمە

- زانایانی مەزهەزی شافیعی- وتویانە حەرامە رووەو گۆری پێغەمبەران و پیاوچاکان یا لای گۆڕیان نوێژ بکرێ، بۆ موبارەکی و بە گەورە گرتنیان، پاشان ئیبن حەجەر دەڵێ: هەندێک لە زانایانی حەنبەلیەکان نوێژکردن لای گۆڕ بۆ تەبەروک، رێک دوژمنایەتی کردنی خواو پێغەمبەری خوایە و داهێنانی ئاینێکە کە خوا رێگەی پێنەداوە، چونکە نەهی کراوە لەوکارەو لەگەڵ کۆ دەنگی زانایان، چونکە بەراستی گەورەترینی حەرامەکان و هۆکارەکانی دروست بوونی شیرک نوێژ کردنە لای گۆڕ، یا دروست کردنی مزگەوت یا خانووە لەسەر گۆری پیاوچاکان.

هەندێک لە زانایانی حەنبەلیەکان دەڵێن: کەسێک کە دەچێ نوێژ لای گۆڕێک دەکات بە مەبەستی پیرۆز کردن (متبركا به) بناغەی دوژمنایەتی کردنی خوای گەورەو پێغەمبەڕی خوایە، داهێنانی ئاینێکە کە خوا رێگەی پێنەداوە، چونکە رێگری کراوە لەوکارەو کۆدەنگی زانایانیشی لەسەرە، بێگومان گەورەترین تاوان و هۆکاری پەیدا بوونی شیرک نوێژکردنە لای گۆڕو دروستکردنی مزگەوتە لەسەر گۆڕ،

هەندێک لە زانایان کە دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ بە کەراهەت ناودەبەن، مەبەستیان ناپەسندی نیە بەڵکو مەبەستیان حەرامە، چونکە ناگونجێ گومان وابەرین بەو زانایانە کارێک بە دروست بزانن کە فەرموودەی موتەواتیر هەیە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی لەو کەسانە کردووە کە ئەوکارە دەکەن، پێویستە پەلە بکرێ لە روخاندنی مزگەوتەکە، و روخاندنی گومەزی سەرگۆڕەکە، چونکە ئەو مزگەوتەی لەسەر گۆڕ دروستکرابێ لە مزگەوتی [ضرار] زیانی زۆرترە، چونکە لەسەر سەرپێچی پێغەمبەر ﷺ، دروستکراوەو

پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردووەو فەرمانی کردووە بە تەخت کردنی ئەو گۆڕانەی بەرزکراونەتەوەو گومەزیان لەسەر دروست کراوە، وە لادانی چراو روناکی سەر گۆڕ.

ئەمانە هەمووی قسەی ئیبن حەجەری هەیتەمیە، الزواجر عن اقتراف الکبائر(١/١٢١)

ئالوسیش لە (روح المعاني ٥/٣١) پشتگیری ئەم قسانەی کردووە

زانایانی شوێن کەوتووی پێشەوا شافیعی لەسەر ئەم بۆچوونەن، لە [التهذیب] و شەرحەکەی کە [مجموع]ە بە درێژی باسکراوە.

مەزهەبی ئەبو حەنیفە:

لە مەزهەبی ئەبو حەنیفەدا دروست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕی پیاوچاکان حەرامە، هەتا پێشەوا محمد قوتابی ئیمام ئەبو حەنیفە دەڵێ: لەگەڵ ئەوەدانین ئەوەی لە گۆڕەکە دەردەهێنرێ بۆ داپۆشینی نابێ هیچی تری بۆ زیادبکرێ، - مەبەستی ئەوەیە تەنها گڵەکەی خۆی بدرێتەوە بەسەریدا - نابێ هەڵبەستن و گومەزی بۆ بکرێ، وە بە

کەراهەتی دەزانین گەجکاری یا قورەساغ بکرێ، یا مزگەوتی لەسەر دروست بکرێ، ( بێگومان لە مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفەدا کە دەڵێن کەراهەت واتە حەرامە) سەرچاوە (الآثار)) لمحمد بن الحسن الشيباني (٤٥)

سێیەم: مەزهەبی ئیمام مالیک:

لە مەزهەبی ئیمام مالیکدا دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ حەرامە: قورتوبی موفەسیری قورئان دوای هێنانی فەرمووده کە دەڵێ: زانایانی ئێمە - واتە مەزهەبی ئیمامی مالیک - وتویانە حەرامە لەسەر موسڵمانان گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان بکەنە مزگەوت.[٣٩]

---

[٣٩] - سەرچاوە (الجامع لأحكام القرآن: للقرطبي (١٠/٣٨)

چوارەم: مەزهەبی ئیمام ئەحمەد

لە مەزهەبی ئیمام ئەحمەددا دروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆر حەرامە: وەک لە کتێبی (شرح المنتهى) و چەندین کتێبی تردا باسکراوە، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن نوێژ کردن لەو مزگەوتانەدا کە لەسەر گۆڕ دروستکراون بەتاڵە، و پێویستە بڕوخێنرێن، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ مزگەوتی [ضرار] روخاند و سوتاندی

پوختەی قسە زۆرینەی زانایان دەڵێن: ئەگەر مزگەوت لەسەر گۆڕ دروست کرابوو مزگەوتەکە دەڕوخێنرێ، ئەگەر گۆڕەکە لەناو مزگەوت نێژرابێ دەبێ گۆڕەکە هەڵکەنرێ و ببرێتە شوێنێکی تر بنێژرێتەوە.

شێخول ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: هەموو پێشەوایان هاودەنگن لەسەر ئەوە نابێ مزگەوت لەسەر گۆڕ دروستبکرێ، دروستیش نیە گۆڕ لەناو مزگەوتدا بنێژرێ، ئەگەر مزگەوتەکە پێشتر دروستکرابوو پێش ناشتنی مردووەکە دەبێ گۆڕەکە لەگەڵ زەوی ڕێک بکرێتەوە یا دەرکرێتەوەو لە شوێنی تر بنێژرێ، ئەگەر مزگەوتەکە دوای ناشتنی

مردوەکە دروست کرابوو، دەبێ مزگەوتە بڕوخێنرێ، یا گۆڕەکە وا تەختکرێ شوێنەواری گۆڕی پێوە نەمێنێ، بێگومان ئەو مزگەوتەی لەسەر گۆڕ دروست دەکرێ، نوێژی فەرزو سوننەتیشی تێدا ناکرێ.[٤٠]

لەکۆتاییدا دەڵێم با زۆر وریابین نەکا ئێمەش بەر ئەم فەرموودە بکەوین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لَتَتْبَعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ شِبرًا شِبرًا وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى قَالَ فَمَنْ)[٤١] واتە: شوێن ڕەوشت و ڕێبازو کردارو گوفتاری گەلەکانی پێش خۆتان دەکەون بست بە بست و گەز بەگەز، هەتا ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بەکونی مار مێلکەشدا ئێوەش شوێنیان دەکەون، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستت گاورو جولەکەیە، فەرمووی: ئەی کێی ترم مەبەستە؟!

---

٤٠ -[مجموع الفتاوى (١/١٠٧) و (٢/١٩٢)
٤١ - متفق عليه

## البركة من الله. بەرەکەت لە خواوەیە.!

بەڕێزان و خوشک و برا ئازیزەکانم لەراستیدا بەنیاز نەبووم بەم زوانە باسی تەبەڕوک و تەوەسول بکەم بەڵام کە دیقەتمدا زۆر کۆمێنت باسی تەبەڕوک و تەوەسول دەکەن هەمووشیان وەک چێشتی مجەور تێکەڵیان کردووە، لەگەڵ ئەوانە مامۆستایەکی بەڕێز پرسیاری تەبەڕوکی کردوو چاوەڕێی وەڵام بوو، لەبەر ئەوە نوسینی ئەو دوو باسەم پێش خست.

باسی یەکەم: تەبەروک

بەرەکەت و تەبەروک واتە بەردەوامی خێرو زیادبوون و زۆر بوون. سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین بەرەکەت تەنها لەلای خواوەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (وبارك لي فيما أعطيت) ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای بەرەکەت لە خوا دەکات، خوا خۆی بەرەکەتە ناوەکانی بەرەکەتە سیفاتەکانی بەرەکەتە، هەر خۆی بەرەکەتی بەخشیوەتە قورئان و پێغەمبەرو بیت الحرام و ئەو شوێن و کاتانەی خوا بەرێزی کردون

تایبەتی کردون و لە شوێن و کاتەکانی تر جیای کردونەتەوە، هەرکەس داوای بەخیشنی بەرەکەت لەهەرکەس بکات وەک ئەوەیە داوای رزق و رۆزی و منالٚ لە غەیری خوا بکات، کەواتە داواکردنی بەرەکەت لە غەیری خوا شیرکە، ئەو شتانەی بە بەرەکەت و پیرۆزن لە قسەو کردارو کەسەکان و کات و شوێنەکان، خوای گەورە پیرۆزی کردوون، ئەو شتانە هۆکاری پیرۆزین، و پیرۆزی و بەرەکەت نابەخشن، وەک چۆن کەسێکی نەخۆش داوو دەرمان بەکاردێنێ و دەرمانەکە شیفای کەس نادات، بەڵکو هۆکاری شیفاکەیە، شیفادەر تەنها خوای گەورەیە، لە شەعدا کە دەڵێی ئەو شتە پیرۆزە، وەک دەرمانەکەیە، خۆی بەرەکەت و پیرۆزی نابەخشێ بەڵکو هۆکاری بەرەکەتە، تەنها هەر خوا بەرەکەت دەبەخشێ.

جوەیریەی کچی حاریس خوا لێی رازی بێ بو بەرەکەت بۆ عەشرەتەکەی، دایکمان عائیشە خوا لێی رازی بێ دەڵێ: نازانم ئافرەتێک هەبێ بەرەکەتی زۆربێ بۆ گەلەکەی بە ئەندازەی جوەیریە، هۆی بەرەکەتی جوەیریە بۆ گەلەکەی ئەوەیە، کاتێک پێغەمبەر ﷺ

دای بەسەر نەوەی (المصطلق)دا چەندین کەسی کردنە کۆیلە، پێغەمبەر ﷺ جوەیریەی کردە خێزانی خۆی، کاتێک هاوەڵان بینیان خزمەکانی خێزانی پێغەمبەر ﷺ کارەکەرو خزمەتکارن لایان ئازادیان کردن، سەدکەس لە خزمانی جوەیریە بەهۆی جوەیریەوە ئازادکران، بێگومان جوەیریە خۆی سەرچاوەی بەرەکەت نەبوو بۆ عەشرەتەکەی، بەڵکو بووە هۆکاری بەرەکەت بۆیان، پێغەمبەر ﷺ فەمووی: (البركة من الله)[٤٢]

تەبەروک دەبێتە دوو بەش:

بەشی یەکەم: تەبەڕوکێکە شەرع ڕێگەی پێداوە، ئەوەی شەرع ڕێگەی پێداوە زۆرن

ئەوەش بریتیە لەو عیبادەتانەی موسڵمان جێ بە جێیان دەکات بە ئومێدی وەرگرتنی پاداشت و چاکە، وەک نوێژو ڕۆژوو قوڕئان خوێندن چەندین عیبادەتی تر، کارکردن بە حوکمە شەرعیەکانی و چوون بۆ مزگەوتی حەرام و مزگەوتی مەدینەو مزگەوتی ئەقساو

---

[٤٢] - اخرجه البخاري

نوێژکردن تێیاندا بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی زۆر، ئەوەش لەبەرەکەتی ئەو مزگەوتانەیە، بێگومان تەبەڕوک بە پێغەمبەریش بەشێکە لە تەبەروکی شەرعی، چونکە فەرموودەی لەسەرە

دووەم: تەبەروکێکە رێگەی پێنەدراوە:

ئەم جۆری دووەمە دەبێتە دووبەش:

بەشی یەکەم: تەبەروکێکە شیرکەو هاوەڵدانانە بۆ خوای بێهاوتا، ئەوەش بریتیە لەوە، هەرکەسێک پێی وابێ ئەو شتەی ئەو بە پیرۆزی دەزانێ، خودی شتەکە پیرۆزو بەرەکەت دەبەخشێ، هەتا تەبەروک بە پێغەمبەریش، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (البركة من الله)

هەرکەس داوای بەرەکەت لە غەیری خوا بکات، یا باوەڕی وابێ غەیری خوا خودی خۆی دەتوانێ فەڕو برەکەتی پێ ببەخشێ ئەوە شەریکی گەورەی بۆ خوا داناوە.

دووەم تەبەڕوکی داهێنراو [بدعي]

تەبەڕوکی داهێنراو ئەوەیە بەڵگەیەکی شەرعی نەبێ بۆ دروستی ئەو تەبەروکە لەگەڵ ئەوە کەسانێک باوەڕیان وایە خوای گەورە پیرۆزی

کردووە، یا بەڵێ شتەکە لەشەرعدا بە پیرۆز دانراوە، بەڵام کەسانێک دێن لایەنی پیرۆزیەکەی دەگۆڕن بە شتێک کە لە شەرعدا نەهاتووە، بێگومان ئەم جۆری بەپیرۆز دانانە حەرامەو دەچێتە قاڵبی شیرکی بچوکەوە، چونکە عیادەتێک دروست دەکرێ کە لە قورئان و فەرموودەدا نەهاتووە، ئەم جۆرە کارانە سەردەکێشێ بۆ پەیدا بوونی شیرکی گەورە.

- ئەم تەبەروک و بەپیرۆز دانانە کە دەڵێین بیدعەیە دەبێتە سێ جۆر:

جۆری یەکەم: بریتیە لە تەبەڕوک بە ئەولیاو پیاوچاکان:

جۆری دووەم: تەبەڕووک بەوکات و شوێن و شتانەی لەشەرعدا نەهاتووە تەبەروکی پێ بکرێ.

جۆری سێیەم: تەبەروک بە شوێنانە کە پیرۆزن بەڵام شەرع ڕێگەی نەداوە تەبەروکی پێ بکرێ، بەو شێوەی خەڵک دەیکات.

خۆشەویستان لەبەشی یەکەمدا باسی ئەوەمان کرد تەبەروکی مەشروع نا مەشروع هەیە، ئێستا دەستدەکەین بەباسکردنی تەبەروکی مەشروع،

- تەبەروک یا بەرەکەتی پێغەمبەر ﷺ:

گەورەترین کەسێک کە پڕاو پڕ بەرەکەت بێ خودی پێغەمبەرە ﷺ خوای گەورە بەرەکەتێکی تایبەتی پێ بەخشیوە، کە بەکەسی تری نەداوە، هەر لەبەر ئەوەیە هاوەڵان رەزای خوایان لێ بێ لە عارەق و تفی پێغەمبەریان ﷺ وەردەگرت و دەیان هێنا بە جسمی خۆیاندا، هەروەها کاتێک سەری دەتاشی یا کورتی دەکردەوە هاوەڵان بە شێوەیەک دەوریان لێ دەدا هەر مویەکی لێ ببوایەوە دەکەوتە سەر دەستی هاوەڵێک،[٤٣]

بوخاری گێراویەتیەوە لە ئەبی جەحیفەوە کە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە نیوەڕۆدا هات بۆ لامان ئاوی دەست نوێژیان بۆ هێناو دەست نوێژی

---

٤٣ -[بوخاری و موسلیم گێراویانەتەوە]

گرت، خەڵک لە ئاوی دەست نوێژەکەیان هەڵ دەگرت ئەیاندا لە جسمی خۆیان پێغەمبەر ﷺ دو ڕکات دو ڕکات نوێژی نیوەڕۆو عەسری کرد، ئەبو موسی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ داوایکرد قاپێکی بۆ بێنن ئاوی تیابێ، هەردوو دەست و دەموچاوی تێدا شۆردو ئاوی لە دەمی ڕادا، پاشان فەرمووی پێیان لێی بخۆنەوەو بیکەن بە دەمو چاوو گەردنتاندا.

لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە کە بیستویەتی لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە شەڕی خەیبەردا فەرمووی: بەیانی ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێک خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو سەرمان دەخات، بۆ بەیانی هەموو هاوەڵان هەستان و ئاواتیان دەخواست ئەو کەسە ئەوبێ، فەرمووی: عەلی لەکوێیە؟ وتیان: چاوەکانی دەیەشێ، فەرمانی کرد بانگی کەن بانگیان کرد، تفی کردە هەردوو چاوی و هەرلەو شوێنەدا چاک بوو، وەک ئەوە کە هیچ شتێکی نەبوبێ.

ئەم فەرموودانەو بەدەیان فەرموودەی تر ئەوەمان پێ دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ خودی خۆی و ئەوەی لە جسمی دەکردەوە وەک موو عارەق و تف

و ئاوی دەستنوێژەکەیی و هەتا لیباسەکانی، وە ئەو شتانەی بەکاری دەهێنا لەقاپ و حەربەو شمشێرو عاساکەیی و .. هتد خوای گەورە بەرەکەتی تێ کردبوون، هاوەڵان کاتێک چاوی پیس لێی دانایە یا نەخۆش بکەوتنایە، یا توشی لەرزو تا بونایە لە شوێنەواری پێغەمبەریان ﷺ هەڵدەگرت و بەکاریان دەهێنا خوای گەورە شیفای دەدان، دوای مردنی پێغەمبەر ﷺ و بە تێپەڕبوونی ساڵ و چەرخەکان شوێنەوارو موو لیباس و قاپ و پێداویستیەکانی تری پێغەمبەر ﷺ هەمووی لەناوچوون و هیچ بەڵگەیەکی بڕوا پێکراومان نیە هیچ شتێک لەوانە مابێ، بێگومان هەر مەتحەفێک موو یا شمشێرێکی خستبێتە ناو شوشەوە، نابێتە بەڵگە کە ئەوە هی پێغەمبەر بێت ﷺ هەڵگیراوەو ماوەتەوە، دروست نیە راگەیەنرا ئەو مووە یا ئەو تاکە نەعلە یا ئەو فڵان شتە لە فڵان مەتحەف هی پێغەمبەرە ﷺ بچین بەکاری بێنین بۆ تەبەروک.

پوختەی قسە لە ئێستادا هیچ ئاسەوارێکی پێغەمبەر ﷺ نەماوە تا خەڵک تەبەروکی پێ بکات.

بێگومان ئەو تەبەڕوکی ئاوی دەست نوێژو تف و عارەق و دەست هێنان بەسەر نەخۆش و قاپەکانی و پێڵاوو جلەکانی تایبەت بووە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، چونکە ئەو تەبەروک و پیرۆزیە خوای گەورە تایبەتی کردووە بەو زاتە گەورەوە، هەتا خەلیفەکانی پێغەمبەری خوا ئەبوبەکری سدیق و عومەری کوڕی خەتاب و ئیمامی عەلی و کە ئامۆزاو زاوای پێغەمبەرە ﷺ، نەبیستراوە هیچ هاوەڵ و تابعینێک هیچ شتێکی ئەو خەلیفانەیان بەتەبەروک دانابێ، خۆ گومانیشمان نیە لە دوای پێغەمبەران علیهم السلام خۆشەویسترین و خواناسترین کەس لە سەر زەوەی ئەبوبەکری سدیقە، باشە پێم ناڵێن کاتێک ئەبوبەکر خۆی و پێویستیاتەکانی تەبەروک نەبوبێ چۆن دەکرێ کەسانێک لە جیهاندا پەیدا ببن خۆیان یا کەل و پەلیان ببێتە تەبەروک بۆ خەڵک، خۆ نزیکترین کەس لە پێغەمبەرەوە ﷺ فاتیمەی کچیەتی باشە لەکوێدا هەیە فاتیمە ئیدیعای تەبەروکی خۆی بکات یا هاوەڵێک باسی تەبەروکی فاتیمەی کردبێ، کەواتە کەس بەناوی نەوەی پێغەمبەرو شێخایەتی و هەر برو بیانویەکی تر بۆی نیە خەڵک

بگەوجێنێ و بەناوی تەبەروک و نزیکی لە خواوە یا هەر ناوێکی تر، خۆی لەخەڵک بە پیرۆزو گەورەتر دەربخات، بڵێ من لای خوا شتم پێ دەکرێ خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) ئەم بنەمایەی خوای گەورە دایناوە هەموو کەس بە هەوڵ و تێکۆشان لە عیبادەت و تاک خواناسیدا بە دڵێکی ساغ دەتوانێ بیگاتێ ئیتر بۆ خەڵک خۆیکاتە کۆلەی خەڵکێکی تر کە خوای گەورە رێی پێ نەداوە، [ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ]. با ئەوەمان لە بیر نەچێ پێغەمبەر ﷺ کاتێک زیندو بوو تەبەڕوک و پیرۆز بوو بەڵام دوای وەفاتی، نەگۆڕەکەی نە گڵی سەر گۆڕەکەی تەبەروک نیە، چونکە هیچ هاوەڵێک و تابیعنێک بۆ نەخۆشی و نەزۆکی و هیچ پێویستیەکی دونیا نەچوونەتە سەر گۆڕەکەی و گڵەکەشیان بەکار نەهێناوە، کاتێ زیندو بووە هاوەڵان داوای دوعای خێریان لێکردووە، بەڵام دوای وەفاتی کەسیان نەچۆتە سەر گۆڕەکەیی و داوای دوعای خێری لێ بکەن، چونکە بەدروستیان نەزانیووەو بەحەرامیان زانیوە.

- بەرەکەتی قورئان:

[وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ] خوای گەورە دەفەرموێ: ناردومانەتە خواز لەم قورئانەدا چەند سورەت و ئایەتێک کە دەبنە شیفاو رەحمەت بۆ باوەڕداران.

قورئان پاککەرەوەی دڵەکانە لە نەزانین و گومڕایی و جەهالەت و نەفامی، لەگەڵ ئەوە خوێندنی قورئان بەرەکەتەو شیفای دڵەکانەو بەکارهێنانی بۆ نەخۆش بەرەکەتەو دەبێتە شیفای دڵ و لاشە، بێگومان هەتا ئەو کەسانەی نەخۆشی دەرونیان هەیە ئەگەر بەباوەڕێکی باشەوە بە بەرنامە گوێ لە قورئان بگرن لەماوەیەکی کەمدا شیفایان بۆ دێ و چاک دەبن و هیچ پێویستیان بە دوکتۆری دەرونی نابێ،

هیچ گومانی تێدانیە قورئان موبارەک و پیرۆزە، چونکە وتەی خوایە، وتەی خواش سیفەتێکە لە سیفاتەکانی خوای گەورە، لەبەر ئەوە قورئان پیرۆزەو دەبێتە شیفا بۆ خەڵک، خوێندنەوەی دەبێتە خێرو

بەرەکەتی زۆر بۆ ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوە هەتا بۆ ئەو کەسەش کە گوێی لێ دەگرێ،

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: قورئان بخوێنن قورئان لە دوارۆژدا دێ شەفاعەت بۆ هاوەڵەکەی دەکات

لەبارەی سورەتی (البقرة] و [آل عمران] دەفەرموێ: ئەم دوو سورەتە لە رۆژی قیامەتدا دێن بەرگری لە خاوەنەکەیان دەکەن.

دەربارەی سورەتی ( البقرة) دەفەرموێ: دەستگرتن بە سورەتی (البقرة)ەوە بەرەکەتە، بیخوێنن و لەبەری بکەن، بێگومان دەست پێوەگرتنی بەرەکەتە، واز لێ هێنانی پەشیمانیە، ساحیر بێ توانایە بەرانبەری. - موسلیم کێڕاویەتیەوە -

## قورئان شیفاو چارەسەرە:

لە ئەسەردا هاتووە (خير الدواء القرآن) واتە: چاکترین چارەسەری نەخۆشی قورئانە، بەڵێ ئەم فەرموودە لە سەنەدا لاوازە بەڵام ماناکەی تەواوە، بە بەڵگەی چەندین ئایەت و فەرموودە. لە دایکمان عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ، دەفەرموێ: هەرکات پێغەمبەر ﷺ شوێنێکی ئازاری هەبوایە، موعەوەزات [ الإخلاص، الفلق و الناس]ی دەخوێندو فوی دەکرد بەخۆیدا، کاتێک ئازاری زۆر بوو من دەم خوێند بەسەریداو لەباتی ئەو دەستی خۆییم دەهێنا بە بەدەنیدا، بە ئومێدی بەرەکەتی قورئانەکە) [موسلیم گێڕاویەتیەوە] چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ بەلای عەشرەتێکدا رۆشتن گەورەی عەشرەتەکە دووپشک پێوەیدا بۆیان چارەسەر نەکرا هاتن بەو هاوەڵانەی پێغەمبەریان ﷺ وت: ئێوە شتێکتان پێ نیە ئەو گەورەمان چارەسەر بکەن، یەکێک لە هاوەڵان وتی: بەڵێ پێمانە حەوت جار سورەتی [الفاتحة] ی خوێند بەسەریداو چاک بوو، فەرموودە زۆرە لەسەر ئەوە

کە قورئان بەرەکەت و پیرۆزو چارەسەرو شیفای دڵ و دەرون و بەدەنیشە، بۆ چارەسەری سیحرو جادوو حەسودی و ... بەکاردێ، باشە خوای گەورە ئەم قورئانە پیرۆزەی بۆ ناردووین بۆ چی هەندێک کەس حەزی لە شوێن کەوتنی و خەرافیاتە، و بەدوای فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراودا دەگەڕێ بۆ بە پیرۆزکردنی شتانێک کە هیچ هاوەڵ و تابعینێک و زانایانی پێشینە چاکەکانی ئەم ئوممەتە نەیان کردووەو بەشتێکی باشیان نەزانیوە، باشە ئێمە قورئانمان هەبێ بەو هەموو پیرۆزیەوە، چ پێویستمان بە شەخس پەرستی و قەبر پەرستیە. خەڵکێکی زۆر بەهۆی گەڕان بەدوای تەبەڕوکدا چوون بۆلای فلان و فیسار شێخ بە ملوێنان دیناری سەرف کردووە خەڵەتاندویانە پارەیەکی زۆریان لێ کێشاوەتەوە بەناوی تەبەروک و چارەسەری نەخۆشی و کێشەو گیرو گرفتەکانی، هیچیشیان بۆ نەکردووە، زۆرجار کێشەی زیاتریش بووە، بەراستی زۆرکەس کە بەرگری لەم جۆرە تەبەروکە ناشەرعی و شیرکانە دەکات لەبەر بەرژەوەندی خۆیەتی و لەبەر خواو بەرژەوەنی خەڵک نیە.

## - ئەو تەبەروک و بە پیرۆز دانانە کە دەڵێین بیدعەیە دەبێتە سێ جۆر:

جۆری یەکەم: بریتیە لە تەبەڕوک بە ئەولیاو پیاوچاکان: لە زنجیرەکانی تردا باسمان کرد کە بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر تەبەروک بە جسم و ئەندام و ئاسەواری پێغەمبەر ﷺ و ئەوشتانەی پێغەمبەر ﷺ بەکاری هێناون، وەک موو عارەق و ئاوی دەست نوێژو جلەکانی و کەل و پەلەکانی و .... هیتد

بەڵام جگە لە پێغەمبەر ﷺ لە هاوەڵان و تابیعین و ئەولیاو پیاوچاکان، هیچ بەڵگەیەکی راست و دروستمان نیە بەڵگەبێ لەسەر دروستی تەبەروک بە جسم و جل و کەل و پەلیان، بە هیچ شێوەیەک گونجاوو دروستنیە پیاوچاکان قیاس کرێنە سەر پێغەمبەر ﷺ چونکە هیچکەس ناگاتە ئاستی پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانیشەوە کە خوای گەورە لە وەسفیانا دەفەرموێ:

[وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ}[٤٤]

له هیچ شوێنێکدا نەهاتووەو باس نەکراوە هاوەڵان تەبەروکیان بە جل و کەل و پەل و شوێنەواری ئال و بەیتی پێغەمبەر و خەلیفە راشیدەکان کردبێ، هەرواها تابیعین و دوای ئەوانیش کەسیان تەبەروکیان بەکەس نەکردووە، ئەگەر ئەوان بە دروستیان بزانیایە دەیان کرد، کە ئەوان نەیان کردووە چۆن گونجاوو دروستە کەسانێکی تر بێن شتێک داهێنن کە پێشتر نەکراوە، ئایە دەرکرێ بڵێین ئەو ئەولیاو پیاو چاکانە لە هاوەڵان گەورەترو بەرێزترن؟!!

هەندێک لەو جۆرە تەبەروکانەی بەناو پیاوچاکان دەیکەن و حەرامە:

- دەڵێم بەناو پیاوچاک چونکە پیاوچاک قەت ناڵێ دەستم یا شتەکانم تەبەروکە -

---

٤٤ -[التوبة: ١٠٠]،

- دەستهێنان بەسەر خەڵکداو لەبەرکردنی لیباسی و خواردنی پاشماوەی ئاوو خواردنەکەیی و ئاوی دەست نوێژ .... هتد

- ماچ کردنی گۆڕەکەیان، و دەست پێدا هێنانی، و هەڵگرتنی گڵی گۆڕەکەی.یا دانانی شت لە سەرگۆڕو مەرقەدەکەی بۆ ئەوەی تەبەڕوکاوی بێ.

بێگومان ئەو کارانە نابەجێ و حەرامەو دروست نیە ئەو کارانە لەگەڵ گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکری.

بەڵام تەبەروک بە دوعاو پاڕانەوەی پیاوچاکان دروستەو شەرعیە، وەک ئەوە بچی بۆلای پیاو چاکێکی زیندوو پێی بڵێی دوعام بۆ بکە ان شاء الله دوعای تۆ گیرایە لای خوای گەورە،

## هەڵوێستی شافیعی و تەبەروک:

ئایە راستە ئیمامی شافیعی تەبەروکی بە گۆڕی ئیمام ئەبو حەنیفەو کراسی ئیمام ئەحمەد کردوە؟

هەندێک لە شێخ پەرست و گۆڕ پەرست هاتوون بۆ برەودان و بە مەشروع دانانی بیدعەو خەرافیاتی تەبروک، هەندێک چیرۆکی درستکراو باس دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە یەکێک لەو پێشەوا گەورانەی خەرافیاتیان بۆ دروستکردوەو داویانەتە پاڵی ئیمامی شافیعیە، بە قسەی ئەوان ئیمام شافیعی کەسێکی ناڵێین موشریک بووە بەڵام بیدعەچی بووە،

لە زۆر کتێبی سۆفیەکاندا ئەم ریوایەتە باس دەکەن و دەڵێن: رەبیع وتویەتی: شافیعی چوو بۆ میسر من لەگەڵیا بووم، وتی ئەی رەبیع ئەم نامەی من بگرە ببیە بیدە دەستی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و وەڵامەکەم بۆ بێنەرەوە، رەبیع دەڵێ چومە بەغدا نامەکەم پێ بوو، کاتی نوێژی بەیانی گەشتم بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نوێژی بەیانیم

لەگەڵ کرد، کاتێک لە میحرابەکە دورکەوتەوە، نامەکەم پێداو پێم وت ئەوە نامەی براکەتە شافیعی لە میسر، ئەحمەد وتی: سەیرتکردووە؟ وتم نەخێر، باوکی عبدالله نامەکەی هەڵچڕی و چاوەکانی پڕبوو لە فرمێسک وتم: چی تێدا نوسراوە باوکی عبدالله، وتی دەڵێ: پێغەمبەری ﷺ لە خەودا بینیوە، فەرموویەتی پێی نامەیەک بنوسە بۆ باوکی عبدالله ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سەلامی منی پێ بگەیەنە و بڵێ تۆ توشی تاقی کردنەوە دەبی، بانگت دەکەن بۆ ئەوەی بڵێی قورئان دروستکراوە، بە قسەیان مەکە خوای گەورە، زانستەکەت بەرز دەکاتەوە هەتا رۆژی قیامەت، رەبیع دەڵێ وتم: مژدەت لێ بێ ئەحمەد ئەویش یەکێک لە کراسەکانی ژێرەوەی کە بەرجسمی کەوتبوو دایکەنی دای بەمن، منیش لێم وەرگرت و بە وەڵامی نامەکەوە گەڕامەوە بۆ میسرو دامە دەست شافیعی، شافیعی پێی وتم: ئەوە چیە ئەحمەد پێی داوی؟ وتم ئەو بلوسەی پێدام کە لەسەر جسمی بوو، شافیعی وتی: پێم ناخۆش نیە پێی داوی، بەڵکو تەڕیکەو ئاوەکەیم بەرێ تا تەبەروکی بێ بکەم.

وەڵامی رۆشن بۆ ئەوانەی دەڵێن ئیمامی شافیعی تەبەروکی بە ژێرکراسی ئیمام ئەحمەد کردووەو بۆ پشتگیری قسەکەیان باسی ئەو بەسەرهاتە دەکەن کە لە زنجیرەی دوازدەیەم و بەشی چوارەم هێنامان.

ئیمامی زەهەبی لە (سير أعلام النبلاء (١٢ـ٥٨٧)دا لە باسی ژیانی رەبیعدا دەڵێ: هیچکات رەبیع سەفەری نەکردووە، ئەوەی کە دەوترێ شافیعی نامەیەکی پیادا ناردووە بۆ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە بەغداد راستنیە.

ئەوەی پشتگیری قسەکانی زەهەبی دەکات ئەوەیە کە رەبیع سەفەری نەکردووەو نەچۆتە بەغدا، هیچ زانایایەکی فەرموودە ناس فەرموودەیان نەگێڕاوەتەوە لە عێراق لە رەبیعەوە بیستبێتیان، لە کاتێکدا رەبیع لەو کەسانەیە کەناسراوە بە گێڕانەوەی فەرموودە.

هەروەها خەتیبی بەغدادی، لە کتێبی (تاريخ بغداد) باسی رەبیعی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەی رەبیع زانایەکی ناودارەو پێگەیەکی گەورەی هەیە.

ئیمامی شافیعی گەشتووە بە چەندین زانا کە لە ئیمام ئەحمەد گەورەترن و تەبەروکیشی پێ نەکردوون، وەک ئیمام مالیک کە مامۆستای شافیعی بووە، هەروەها سۆفیانی کوڕی عوەینە و چەندین زانایتر.

- لە هەندێک سەرچاوەشدا هاتووە کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کراسی شافیعی شۆردووەو لە ئاوەکەی خواردۆتەوە بە مەبەستی تەبەروک بە کراسی شافیعی، بێگومان ئەو گێڕانەوە ئەسڵی نیەو دروستکراوەو شیعەکان بۆ مەبەستی گڵاوی خۆیان زۆر گرنگی بەو گێڕانەوە دەدەن.

ئەو گێڕانەوەی کە باسی تەبەروکی شافیعی بە کراسی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکات بەسێ سەنەد هاتووە،

سەنەدی یەکەم: لە (تاریخ دمشق لابن عساكر ٥ـ٣١٢)، وە (مناقب الإمام أحمد لابن الجوزي صفحة: ٦٠٩) وە لە رێگەی (ابن الجوزي)ەوە مەقدیسی لە کتێبی (محنة الإمام أحمد صفحة: ٧) گێڕاویەتیەوە.

ئەم سەنەدە محمدی کوڕی حسین باوکی (عبدالرحمن)ی سەلمی تیایە، کە تاوانبار بە دروستکرنی فەرمووده، لە پشت ئەویشەوە کەسانێکی تیایە مێژووی ژیانیان نیە.

سەنەدی دووەم: ئەم سەنەدە لە (تایخ دمشق لابن عساكر (٥ـ٣١٢) هاتوو، هەر لەڕێگەی ئەوەوە سبوکی لە (طبقات الشافعية الكبرى (٢ـ٣٥) هێناویەتی و لە سەندەکەیدا گۆڕانکاری تیایە، لە (ابن عساكر)دا (جعفر بن محمد المالكي)ە، لە (الطبقات)دا (أبو جعفر محمد الملطي) لەگەڵ ئەوە لەم سەندەدا کەسانێکی تیایە بەدوادا چوون بۆ ژیانی نەکراوە، یا کەسێکی ناسراونیە.

سەنەدی سێیەم: ئەم سەنەدەش کەسانێکی تیایە باسی ژیانیان نەکراوەو کەسانێکیشی تیایە نەناسراوە.
پوختەی قسە ئەوەیە ئەم گێڕانەوە ئەسڵی نیەو درۆیەکی ئاشکرایەو ئیعتیباری نیە.

یەکێکی تر لەو خورافیاتانەی بۆ شافیعی دروستکراوە، دەڵێن:
شافیعی تەبەروکی بە گۆڕی ئەبو حەنیفە کردووە
خەتیبی بەغدادی بە سەنەدی خۆی لە (تاريخ بغداد (١٢٣/١) گێڕاویەتیەوە (أخبرنا القاضي أبو عبد الله الحسين بن علي بن محمد الصيمري ، قال : أنبأنا عمر بن إبراهيم المقرئ قال : نبأنا مُكرم بن أحمد قال : أنبأنا عمر بن إسحاق بن إبراهيم هەتا دەگاتە عەلی کوڕی مەیمون دەڵێ بیستم شافیعی دەیووت: من تەبەروک بە گۆڕی ئەبو حەنیفەوە دەکەم، و هەموو رۆژێک دەچمە لای گۆڕەکەی، ئەگەر کارێکم بۆبێتە پێش دوو رکات نوێژ دەکەم و ئەچم بۆ لای گۆڕەکەی، لەلای

گوڕەکەی ئەبو حەنیفە لە خوا دەپاڕێمەوە، کە هەستم دەڕۆم زۆر دوورناکەومەوە کارەکەم جێ بەجێ دەبێ.

وەڵامی ئەو گێڕانەوەی لەبارەی تەبەروکی ئیمامی شافیعی بە گۆڕی ئیمام ئەبوحەنیفە باس دەکەن.

ئەلبانی لە [سلسلة الضعيفة ٣١/١] دەڵێ: ئەو گێڕانەوە لاوازە بەڵکو بەتاڵە بێگومان عەمری کوڕی ئیسحاق کە لە سەنەدەکەدا ناوی هاتووە، کەسێکی نەناسراوە، لە هیچ کتێبێکی ریجالی سەنەدا باسی نەکراوە، داواتان لێدەکرێ سەحیحی سەنەدی ئەم گێڕانەوە رۆشن بکەنەوە، ئەگەر وانەکەن ئەوە بە قسەی شافیعی خۆی قسەکەتان بەرپەرچ دەدرێتەوە، کە دەفەرموێ: ئەوکەسەی بە دوای فەرموودەدا بگەڕێ بەبێ سەنەد، وەک ئەو کەسەیە بەشەودا دار کۆدەکاتەوەو کۆڵە دارەکەی ماری تیایەو پێی نازانێ، [فيض القدير ٤٣٣/١] بەم وتەی ئیمامی شافیعی ئێوە لەشەوی تاریکدا دارکۆدەکەنەوە ئەگەر سەنەدێکی راست و دروست نەهێنن، بەڵام ئێمە سەنەدێکی بەهێزتان

لە شافعیەوە بۆ دەهێنین لە کتێبی خۆیەوە، کە دەڵێ: پێم ناخۆشە دروستکراوانی خوا (تبارک و تعالا) گەورە بکرێ تا وای لێدێ گۆڕەکەی وەک مزگەوتی لێ بکرێ، لەترسی فیتنە لەسەر خۆی و ئەوانەی لەدوای ئەوەوە دێن لە خەڵکی، [ الأم ٢٧٨/١، المهذب ١٣٩/١-١٤٠، روضة الطالبين ٦٥/١، المجموع ٢٦٦/٥ و٢٥٧/٨]، ئەگەر تەبەروکی شافیعی بە گۆڕی ئەبو حەنیفە راستبێ، خەڵک پێیان دەوت چۆن دەترسی خەڵک توشی فیتنە ببن بەڵام لە خۆت ناترسی توشی فیتنە ببی؟!

- ئەگەر شافیعی تەبەروک بە گۆڕ بکات، چۆن نەهی دەکات لە دروستکردنی خانوو گومەز لەسەری، بێگومان سۆفی لەگەڵ ئەم فەتوای شافیعی نین، روخاندنی خانوو گومەزی سەر گۆڕ بە لەناوبردنی گۆڕەکەی دادەنێن.

- لە چەرخی شافیعیدا گۆڕی ئەبو حەنیفە کەس نەدەچوە سەری بۆ پاڕانەوە لای گۆڕەکەی، شتێکی زانراوە بەلای زانایانەوە، هەر گومەزو بینایەک لەسەر گۆڕ دروست بکرایە دەڕوخێنرا، شافیعی خۆی دەڵێ: دەمبینی کاربەدەستان هەر گۆڕێک بینای لەسەر بکرایە دەیان روخاند، نەم بینی زانایانی شەرعزان بەخراپی بزانن، [المجموع ٢٩٨/٥، شرح مسلم للنووي ٢٤/٧، الجنائز باب ٣٣، وأنظر مواهب الجليل ٦٥/٣]

(البيضـــاوي) خاوەنی تەفسیری (البيضـــاوي)دا دەڵێ گاورو جولەکە دەچوونە لای گۆڕی پیاو چاکەکانیان بۆ نوێژو پاڕانەوە، [حاشية سنن النسائي ٤٢/٢]، ناکرێ شافیعی بچوێنرێ بە گاورو جولەکەوە.

لە (مجمع الأنوار في شرح ملتقى الأبحر ٣١٣/١)، و[ حاشية ابن عابدين على رد المحتار ٤٣٩/٢] و البحر الرائق ٢٩٨/٢] و [روح المعاني للآلوسي الحنفي ٣١٣/١٧] و [مجمع الأنهر شرح ملتقى الأبحر ٣١٣/١] هاتووە کە رێگریان کردووە لە پاڕانەوە لەلای گۆڕ.

- لەکۆتایی ئەم وەڵامەدا قسەی شێخ عبدالرحمن دەهێنین لە (موسوعة أهل السنة ٢٦٣/١)) لەسەر ئەو درۆیە، دەڵێ: لەکوێ شافیعی هەموو رۆژێک هاتووە بۆسەر گۆڕی ئەبو حەنیفە لەکاتێکدا شافیعی لە حیجازو یەمەن و شام و میسرو عێراق ژیاوە، لەو شوێنانە گۆڕی پێغەمبەران و هاوەڵان و تابیعینی بینیوە، کە بەلای شافیعی و خەڵکیشەوە لە ئەبو حەنیفەو هاوشێوەکانی ئەبو حەنیفە گەورەترو باشترن، بۆ تەنها لای گۆڕی ئەبو حەنیفەی هەڵبژارد، بۆ نەچۆتە لای گۆڕی پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵەکانی بپاڕێتەوە، باشە بۆ باس نەکراوە شافیعی هاتبێتە لای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بپاڕێتەوەو تەبەڕوکی پێ بکات، خۆ ناگونجێ شافیعی رێزی گۆڕی ئەبو حەنیفەی دابێ بەسەر گۆڕی بەڕێزترین نەوەی ئادەم و هاوەڵە بەڕێزەکانی؟!!

باشە ئێوە زاناترن بە مەزهەبی شافیعی لە نەوەوی کە دەیگێڕێتەوە کەکۆدەنگی زانایانی ئەم ئوممەتە رێگریان کردووە لە نزیک کەوتنەوە لە گۆڕو دەست لێدانی و ماچ کردنی، لە حەلیمی و زەعفەرانی و ئەبو موسای ئەسفەهانی ئەو ئیجماعە گوازراوەتەوە.

- ئەبو حەنیفە ڕێگری کردووە لە تەوەسول بۆلای خوا بە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، دەڵێ: دروستنیەو نابێ هیچ کەس بپاڕێتەوە بە غەیری خوا، دەڵێ: بە حەرامی دەزانم بڵێ: داوات لێدەکەم بەوانەی نزیکن لە عەرشەکەتەوە، یا بڵێ: داوات لێدەکەم بەحەقی فڵان و بە حەقی پێغەمبەرەکانت و بەحەق (البيت الحرام).

ناگونجێ شافیعی ئەوە نەزانێ

ئایە ئەبو حەنیفە ڕازی بووە کەس لای گۆڕەکەی نوێژو عیبادەت بکات؟ ئەگەر دەڵێی دوعای کردووە نەک عیبادەت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (الدعـاء هو العبــادة)

- هیچ زانایەک لە کاتی ئەبو حەنیفەو دوای ئەویش ڕازی نەبوون بە پاڕانەوە لەلای قەبر، بەردەوام ڕێگریان کردووە لەدەستدان لە گۆڕ (الفتاوى البزازية) و (التتارخانية) وتویانە دەستدان لەگۆڕ بۆ پیرۆزی لە نەریتی گاورەکانە.

- ئەگەر گریمان راستبێ شافیعی لەلای گۆڕی ئەبو حەنیفە لە خوا پاڕاوەتەوە، بەڵام زۆرینەی خۆ سۆفی و دەروێشەکان و خەڵکی نەزانی تریش دەچن لە شێخەکە دەپاڕێنەوەو دەڵێن مەدەد یا شێخ عبدالقادر گەیلان، مەدەد یا شێخ جنید بەغدادی، مەدەد یا روفاعی، مەدەد یا شێخ فلانی ...

هتد، دەیانەوێ ئەو شێخە فریایان بکەوێ، ئایە ئەو پاڕانەوەی ئەوان لەگەڵ پاڕانەوەکەی شافیعی زۆر جیاوازنیە؟ بێگومان ئەو شێوە پاڕانەوەی شافیعی کە ئێوە دەیلێن نابێتە شیرکی گەورە، بەڵام ئەوەی ئەو سۆفی و دەروێشانە دەیکەن بێگومان شیرکی گەورەیەو هاوەڵ دانانە بۆ خوای تاک و تەنها.

## پوچەڵکردنەوەی بەڵگەی دروستی تەبەروک بە گۆڕی پیاوچاکان.

لە زنجیرەکانی پێشوو باسی تەبەروکی شافیعی بە کراسی ئیمام ئەحمەدو گۆڕیئەبو حەنیفەمان کرد، ئێستا باسی چەند بەڵگەیەکی تری سۆفیەکان دەکەین بۆ دروستی تەبەروک و وەڵامیشیان دەدەینەوە تا بەرچاوتان رۆشنبێ و بەو قسانە نەخەڵەتێن.

١ - دەڵێن (الحافظ ابن الجوزي الحنبلي) لە کتێبی (صفة الصفوة (٤١٠/٢) لەسەر ژیانی ئبراهیم، حەربیدا وتویەتی: لە ساڵی ٢٨٥ لەبەغدا مردووەو گۆڕەکەی ئاشکرایەو خەڵک تەبەروکی پێ دەکەن.
ئێمەش دەڵێین بێگومان ئەم قسەی ئیبن جەوزی نابێتە بەڵگەی دروستی تەبەروک، چونکە ئیبن جەوزی باسی ژیانی ئەو زانا خواناسە دەکات، و دەڵێ خەڵک تەبەروکی پێ دەکەن و خۆ باسی دروستی تەبەروک بەگۆڕی ئیبراهیم حەربی ناکات، ئێستا هەر کەسێک لە ئێمە باسی زانایایەک یا ئەولیایەکی خوا بکات و بڵێ گۆڕەکەی لە فلان شوێنە بەردەوام خەڵک دەچێت لەسەر گۆڕەکەی

لێی دەپارێنەوە، مانای ئەوەیە کاری ئەو خەڵکە نەفام و سەر لێشێواوانە بەدروست دەزانێ نەخێر، بێگومان ئەو قسەی ئیبن جەوزیش ئاوایە، ئەنجا بەلامەوە سەیرە کەسانێک بێن بۆ پشتگیری کاری جەهالەتی خۆیان پشت بە قسەیەکی ئیبن جەوزی ببەستن لەکاتێکدا دەزانن ئین جەوزی قوتابی ئیبن تەیمیەیەو زۆر دژی چونە سەر گۆڕی پیاوچاکانە بە مەبەستی تەبەروک و پاڕانەوە لێیان.

٢ - دەڵێن: (شمس الدین محمد الجزري) لە کتێبی (تصحیح المصابیح)ەکەیدا دەڵێ: من سەردانی گۆڕی ئیمام موسلیمم کردووە هەندێک لە سەحیحەکەیم لای گۆڕەکەی خوێندەوە، بە ئومێدی باش و تەبەروک، شوێنەوارو کاریگەری بەرەکەتەکەییم بینی، بێگومان قسەو کرداری هیچ زانایەک نابێتە بەڵگە، هەر زانایەک هەر قسەو کردارێکی پێچەوانەی قورئان و فەرموودەبێ لێی وەرناگیرێ و دەدرێتەوە بەسەریدا، ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس دەفەرموێ:

(كُلُّ أَحَدٍ يُؤْخَذُ مِنْهُ وَيُرَدُّ عَلَيْهِ إِلاَّ صَاحِبُ هَذَا القَبْرِ) هەموو کەس قسەی لێ وەردەگیرێ و قسەیشی ڕەد دەکرێتەوە تەنها خاوەنی ئەم گۆڕە نەبێ - مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ

٣ - دەڵێین لە کتێبی (سير أعلام النبلاء)دا لەکاتی باسی نەفیسە خاتوون لە (ب، ل ١٠٧/١٠) ئیمامی زەهەبی دەڵێ: دەوترێ (قيل) لەو ئافرەتە خواناسانەیە کە پاڕانەوە لای گۆڕەکەی گیرایە، بەڵکو پاڕانەوە لای گۆڕی پێغەمبەران پیاوچاکانیش وەرگیراوە،

لە وەڵامدا دەڵێین: باشە بۆچی هەندێک لە سۆفی و گۆڕ پەرستان بۆ سەلماندنی قسەو بۆچونێک کە خەرافیاتەو هاوەڵان و تابیعین نەیان کردووەو بە دروستیشیان نەزانیوە، پێچەوانەی چەندین فەرموودەی سەحیحە، بەدوای شتی لاوازو زەعیفدا دەگەڕێن، وەک دەوترێ ئەگەر چڵە پوشێکیان دەستکەوێ دەستی بۆ دەبەن، لێرەدا ئیمامی زەهەبی خۆی ناڵێ لای گۆڕی نەفیسەو. دوعاکردن گیرایە، ئەو قسەش لە سەرچاوەیەکی دیارو باوەڕ پێکراو نەی گواستۆتەوە، بەڵکو

دەڵێ (قيل) بێگومان بەکارهێنانی قیل لای هەمووکەس رۆشنە واتە ئەو سەرچاوەی ئەو قسەی کردووە لاوازە، کەواتە قسەکەش لاوازەو بۆ پشت پێ بەستن نابێ.

٤ - دەڵێن: خەتیبی بەغدادی لە ( تاريخ بغدادَ)دا لە (أحمد بن جعفر بن حمدان القطيعي) دەگێڕێتەوە کە حەسەنی کوڕی ئیبراهیمی خەلال وتویەتی: هەرکارێک نارەحەت بوبێ لەسەرم و چوبمە لای گۆڕی موسای جەعفەرو تەوەسولم پێکردبێ، خوای گەورە لەسەرمی ئاسان کردووە بەو شێوەی خۆم پێم خۆش بووە.

لەوەڵامدا دەڵێین:

- گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بەرێزترو گەورەترە لە گۆڕی موسای کوڕی جەعفەر، کاتی بێبارانی بوو عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێ لەبەردەم هەموو هاوەڵاندا تەوەسولی بە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ نەکرد[٤٥]

---

٤٥ -(رواه البخاري)

- ئیبن حەجەر دەڵێ: ئیمام مالیک ڕێگری کردووە کە بوترێ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرم ﷺ کرد[٤٦] چۆن دروستە کەسێک بڵێ دەچم بۆ سەر گۆڕی فلان کەس تا پێویستیەکانم بۆ جێ بەجێ بکرێ.

- ئەم گێڕانەوەی چونی حەسەن بۆلای گۆڕی موسای کوڕی جەعفەر، ئەحمەدی کوڕی جەعفەری کوڕی حەمدانی قەتیعی لە سەنەدەکەدایە، کە گێڕانەوەکانی تێکەڵ کردنی تیایە، وەک (ابن الصلاح) لە زانیازی فەرموودەدا لە باسی (من رمي بالاختلاط ٥٢/١ وكتاب المختلطين ٦/١) باسی دەکات.

لێرەدا ڕۆشنمان کردەوە کە هەندێک لە زانایان ئەم گێڕانەوە بەلاواز دەزانن چونکە ئەحمەدی کوڕی جەعفەر لە کۆتاییی ژیانیدا توشی تێکەڵکردن بووە. ئەگەر قسەکەش ڕاستبێ کرداری ئەم زانا بەڕێزە نابێتە بەڵگەی دروستی چونە سەرگۆڕ بە مەبەستی تەبەڕوک.

---

٤٦ -[فتح الباري ٣ / ٦٦) (الذخيرة للقرافي ٣/٣٧٥]

سەرەتا دەڵێم: داوایەکی برایانەو دڵسۆزانە بۆ سەلامەتی عەقیدەو بیروباوەڕمان و ڕەزامەندی خوای بێ هاوەڵ، با لەباتی ئەوەی بە دوای قسەی لاوازو لێکدانەوەی بێکەڵک و شەرعاندنی ناشەرعی بگەڕێین، بابێین گوێ لە قورئان بگرین و ئایەتەکانی بەجوانی بخوێنینەوە و گوێی لێ ڕاگرین و هەر فەرمانێکی کرد بڵێین: [سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ] خوایە گیان بیستمان و گوێڕایەڵین، ئەی ئەوانەی دەڵێن موسڵمانین و ئومێدی بەهەشتان هەیەو لەگەڵ ئەوە هەموو کاری ڕۆژانەتان دەعوەو بانگەوازتان بۆ هاوار کردن و تەبەروک و تەوەسولە بە گۆڕی پیاوچاکان، یا بەناو شێخانێکی دڵ نەخۆش و دوور لە عەقیدە پاکەکەی رسول الله ﷺ و عولەماو صولەحاو ئال و بەیتی رسول الله ﷺ، ئەگەر بەراست گوێڕاڵی قورئانن، خوا دەفەرموێ: [وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ] ئەوەی پێغەمبەری ﷺ پێهاتووەو پێی ڕاگەیاندوون وەریگرن و ئەوەی ئەو ڕێگری لێ کردوون وازی لێ بێنن.

بەسە ئەوەندە کرداری فڵان زاناو فیسارکەس مەکەنە بەڵگە بۆ گومڕایی خۆتان و سەر لێشێواندنی خەڵکی داماو، لە ئوسوڵی فیقهدا کۆدەنگی زانایان دەفەرموون: سەرچاوەی دین قورئان و سوننەت و ئیجماعە هەندێکیش دەفەرموون قیاسە، قسەی بەهێز ئەوەیە قسەو کرداری هاوەڵێک لە هاوەڵان نابێتە بەڵگە، ئیتر ئێوە بۆ دەچن بەدوای کرداری زانایەکدا دەگەڕێن، بۆ خەڵەتاندنی خۆتان و شوێن کەوتوەکانتان، لە کاتێکدا زۆرینەی کرداری ئەو زانایەی ئێوە دەیکەنە بەڵکە سەنەدی زەعیفەو ئەسڵی نیەو بۆی دروستکراوە، بۆ نمونە تەبەروکی ئیمامی شافیعی بە کراسی ئیمام ئەحمەدەوە یا بە گۆڕی ئیمام ئەبو حەنیفە، کە پێشتر ڕۆشنمان کردەوە، دروستکراوە بۆی و پێچەوانەی قسەو فەتواکانی خۆی و زانایانی مەزهەبە کەشیەتی،

ئێستا بابێینەوە سەر بەڵگەی ئەوانەی تەبەروک بە گۆڕی پیاوچانەوە بەدروست و باشیش دەزانن.

بەڵگەیەکی تری ڕەواجدەرانی تەوەسول بە گۆڕو پیاوچاکان بریتیە لە:

٥ - دەڵێن: بیلال حەبەشی بانگ بێژی پێغەمبەر ﷺ لە خەودا پێغەمبەری ﷺ بینی فەرموویەتی پێی بۆ ئەوەندە ساردو سڕی ئەی بیلال؟ ئایە کاتی ئەوە نەهاتوە سەردانم بکەی بیلال، کاتێک بەخەبەرهات خەمبارو دڵ تەنگ بوو، ترسی لێ نیشتبوو، سوار وڵاخەکەی بوو چوو بۆ مەدینەو چووە لای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ ، لای گۆڕەکەی گریاو دەم و چاوی خستە سەرگۆڕەکەو حەسەن و حوسەین هاتن بۆلای و ئەویش باوەشی پێداکردن و گوشینی بەخۆیەوەو ماچی کردن و بە بیلالیان وت: پێمان خۆشە ئەو بانگە ببیستین کە بۆ پێغەمبەرت ﷺ دەوت لە بەیانیدا، بەگوێی کردن چووە سەربانی مزگەوت، لەو شوێنە ڕاوەستا کە زوو ڕادەوەستا، کاتێک وتی: الله أكبر الله أكبر مەدینە لەریەوە، کاتێک وتی أشهد أن لا إله إلا الله لەرینەوەی مەدینە زیادی کرد، کاتێک وتی: أشهدُ أن محمداً رسولُ الله

کچان لەماڵی خۆیان هاتنە دەرەوە، وتیان ئایە پێغەمبەر ﷺ زیندو بۆتەوە، هیچ رۆژێک بە ئەندازەی ئەو رۆژە خەڵک نەگریاوە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەم ئەسەرو گێڕانەوە لە بارەی بیلالەوە راست نیە، گێڕانەوەیەکی غەریب و مونکەرە، سەنەدەکەی نا مەعلومەو پچڕان لە سەنەدەکەیدا هەیە، ئیمامی زەهەبی دەڵێ: (إسناده لينٌ، وهو مُنكرٌ) ئیبن حەجەر دەڵێ: ئەم چیرۆکە بەرۆشنی دیارە دروست کراوە.

ئیبن حەزم دەڵێ: باسمان کردووە دووکەس نیە لە گێڕەوەی فەرموودە نەڵێ بیلال هیچ کات بانگی بۆکەس نەداوە لەدوای وەفاتی تەنها جارێک نەبێ لە شام بانگی دا بەڵام بۆی تەواو نەکرا.

٦ - دەڵێن: ئیمام ئەحمەد لە کەسیری کوڕی زەید لە داودی کوڕی ئەبی ساڵحەوە ریوایەتی کردووە کە رۆژێک مەڕوان چووە بۆلای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بینی پیاوێک دەمو چاوی خستۆتە سەر گۆڕەکە، وتی: دەزانی چی دەکەی، پیاوەکە روی تێکرد بینی ئەبو ئەیوبە، وتی: بەڵێ:

هاتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ نەهاتووم بۆلای ژوورەکەی، بیستم لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ ئایین مەگرین ئەگەر خاوەنی خۆی بەرێوەی برد، بەڵام ئەگەر غەیری خاوەنی خۆی بەرێوەی برد بۆی بگرین.

لەوەڵامدا دەڵێین: فەرموودەکە لاوازە چونکە داودی کوڕی ئەبو ساڵحی تیایە، ئیمامی زەهەبی دەڵێ: حیجازیەو کەسێکی ناسراونیە، ئیبن حەجەر لەگەڵی هاوڕایە، نەسائیش بە زەعیفی داناوە، زانایانی موحەقیق وەک نەوەوی و کەسانی تریش ئینکاری ئەم فەرموودەیان کردووە

بەرێزان و خۆشەویستان ئەوە چەند بەڵگەیەکی لاواز بوو لەدەیان بەڵگەی لاواز کە سۆفی و بیدعەچی و گۆڕ پەرست شەخس پەرست پشتیان پێ بەستووە بۆ کارەکانیان، بەڵگەکانی تریان باس ناکەم چونکە بابەتەکە درێژە دەکێشێ و بەڵگەکانی تریشیان لەم بەڵگانە بەهێزترنین.

## ماچکردن و دەستدان لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ.

بەردەوام ئەوانەی کە شوێن حەزو ئارەزوەکانی خۆیان کەوتوون و نایانەوێ حەق ببیستن و شوێنی بکەون، بەیناو بەین گومان و دودڵی لە شتانێکدا دروست دەکەن کە سەلمێنراوەو هیچ گومانێک هەڵناگرێ لە ئایینی خوادا، وەک هاوار کردن لە غەیری خوا، یا تەوەسول بە پێغەمبەران و پیاوچاکان، و تەبەروک بە گۆڕیان و چەندین شتی تر، بۆ دروستکردنی ئەم گومانە دێن هەندێک جار فەرموودەو ئەسەری لاواز یا دروستکراو دەهێنن، هەندێکجار دێن قسەی زانایان و پێشەوایانی سەلەف دێنن، جا قسەکان یا پەڕگیرە، یا لە مەبەستی خۆی لای دەدەن، ئەوەش بۆ دروستکردنی دڵەراوکێ و گومانە لە بیروباوەڕی موسڵماندا، یا دروستکردنی ناکۆکی و دووبەرەکیە لە نێو موسڵماناندا بە لێدانی زانایان بە قسەی هەندێک لە زانایان.

جا یەکێک لەوبابەتانەی هەندێکجار دەجوڵێنرێ و رەواجی پێ دەدرێ ناوە ناوە گەرم دەکرێتەوە، باسی دەستدان و ماچ کردنی گۆڕی پێغەمبەرو ﷺ و تەبەروک پێکرنیەتی.

ماچکردن و تەبەروک بەگۆڕی پێغەمبەر ﷺ

یەکەم: گەورەترین بەڵگە بۆ بەتاڵی و بێ بنەمایی قسەی ئەوانەی دەڵێن: دروستە بۆ پیرۆزی دەست لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بدرێت و ماچ بکرێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مَن أَحْدَثَ في أمْرِنا هذا ما ليس فيه، فهو رَدٌّ)[٤٧] لە ریوایەتی تری موسلیمدا (مَن عَمِلَ عَمَلاً ليس عليه أَمْرُنا، فهو رَدٌّ)

بێگومان دەستدان لەگۆڕو ماچکردنی بە مەبەستی پیرۆزی، فەرمانی خواو پێغەمبەری لەسەر نیە، کەوابوو لە ئیسلامدا رەددەکرێتەوەو دوورە لە شەریعەتی ئیسلام.

ئەوەتا ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەیدا دەڵێ: (باب: ما ذُكِرَ من دِرعِ النبيِّ ﷺ ، وعصاه، وسَيفِهِ وقدَحِهِ، وخاتَمِه، وما استَعمَلَ الخُلفاءُ بعدَه

[٤٧] -[رواه البخاري ٢٦٩٧ )، ومسلم ( ١٧١٨]

من ذلك ممَّا لم يُذكَر قِسمتُه، ومِن شَعَره، ونَعْلِه، وآنيتِه ممَّا يَتبرَّكُ أصحابُه وغيرُهم بعدَ وفاتِه).

هەروەها لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: (باب: طِيبُ رائحةِ النبيِّ ﷺ ولِينُ مَسِّه والتبرُّك بمسحِه).

وباب: (طِيبُ عَرَقِ النبيِّ ﷺ والتبرُّك به).

بۆ باسی گۆڕو حوجرەو دیوارەکانی حوجرەی پێغەمبەر ﷺ نەکراوە، لە فەرموودەی سەحیحدا بە سابتی هاتووە کە عبداللەی کوڕی عومەر بەخراپی زانیوە دەست لە قەبری پێغەمبەر ﷺ بدرێ.[٤٨]

---

[٤٨] - أخرجه محمد بن عاصم في (جزء له ٢٨) بإسناد متَّصل، رجاله كلُّهم ثقاتٌ أثبات

## فەتوای زانایان

بە فەتوای هەموو زانایانی ئەم ئوممەتە دروست نیە دەست لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بدرێ و ماچ و تەبەروکی پێ بکرێ، لێرە فەتوای هەندێک لە زانایانە دێنم لە زانایانی هەر چوار مەزهەبەکەو چەندین زانای تر کە بەدروستیان نەزانیەوەو بە بیدعەو خەرافاتیان داناوە، هەتا هەندێکیان ئەو کارەیان شوبهاندووە بە خوو نەرتی گاورو جولەکە، یەکێک لەو زانایانە شێخ عبدالقادری گەیلانیە، کە ئێستا هەندێک کەس خەریکی شیرک و هاوارکردن لە غەیری خوای گەورەن، و دەستدان لە گۆڕی پێغەمبەرو پیاوچاکان و ماچ کردنی و تەبەروک پێکردنی بە عیبادەت و خواناسی دادەنێن دەشڵێن ئێمە موریدو شوێن کەوتووی ئەوین، [سُبْحَانَكَ هَٰذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ] بێگومان شێخ عبدالقادری گەیلانی زۆر زۆر دوورە لەوانەوە، ئەوەتا ئەو دەفەرموێ: ئەگەر کەسێک سەردانی گۆڕێکی کرد با دەست نەخاتە

سەر گۆڕەکەو ماچی نەکات، چونکە ئەوە عادەت و نەرێتی جولەکەکانە،[٤٩]

هەتا ئیمامی غەزالیش کە شێخ و مامۆستایانی سۆفی و دەروێشەکان والە خەڵک تێدەگەیەنن سۆفیەتیەکەی ئیمامی غەزالیش وەک ئەمان وابووەو باوەڕی بەو بیدعەو خەرافیاتانە هەبووە، غەزالی دەڵێ: بێگومان دەستدان لە گۆڕی پیاوچاکان و ماچکردنی عادەت و نەریتی جولەکەو گاورەکانە.[٥٠]

هەروەها دەڵێ: دەست لە گۆڕو بەردەکەی مەدەن، بێگومان ئەوە عادەت و نەریتی گاورەکانە.[٥١]

شێخ عبدالرحمن عیمادی نەقشبەندی کە ساڵی ١٠٥١ وەفاتی کردووە، دەڵێ: ئەو کەسەی دەچێتە لای گۆڕی پێغەمبەر دەبێ خۆی دەپارێزێ لە دەستدان لە شوشەکەی و دەست هێنان بەدەم و چاویدا بۆ تەبەروک، بێگومان ئەوە لە عادەت و نەریتی گاورو جولەکەیە،

---

[٤٩] -[الغنية ١/٩١].
[٥٠] -(إحياء علوم الدين ٤/٤٩١)
[٥١] -(إحياء علوم الدين ١/٢٥٩)

نەگوازراوەتەوە لەهیچ پێشەوایەکی خاوەن ئیجتیهادو زانایەکی باوەڕ پێکراو ئەو کارەیان کردبێ.[٥٢]

هەرکەسێک بڵێ مەچنە سەرگۆڕی پیاوچاکان بۆ دەست لێدان و ماچکردنی و دەم چاو خستنە سەر گۆڕەکەی بە مەبەستی تەبەروک، چونکە کارێکی حەرام و ناشەرعیە، یەکسەر دەڵێن ئەوە وەهابیە، بێڕێزی بە پیاوچاکان دەکات، ئێستا دەپرسم ئایە شێخ عبدالقادری گەیلانی و ئیمامی غەزالی و شێخ عبدالرحمن عیمادی نەقشبەندی ش وەهابین، ئەوانەیش بێڕێزی بە پیاوچاکان دەکەن.

١ - ئیمامی نەوەوی دەڵێ؛ زانایان وتویانە دەستدان لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و ماچکردنی کارێکی خراپ و ناپەسندە، بەڵکو ئەدەب و ڕێز ئەوەیە دووربی لێی، وەک چۆن ئەگەر زیندوبێ و لە خزمەتیابی دوور دەوەستی، ئەوە ئەو بۆچوونە راستەکەیە کە زانایان فەرموویانەو بەجێیان هێناوە.[٥٣]

---

٥٢ - المستطاع من الزاد لأفقر العباد ص ١٨).
٥٣ ٠(المجموع شرح المهذب)) (٢٧٥/٨).

٢ - شەریف سەمهودی زانای ناوداری شافیعی مەزهەب دەڵێ: ئەقشەهری وتی: زەعفەرانی لە کتێبەکەیدا وتویەتی: دانانی دەست لەسەر قەبری پێغەمبەرو ﷺ دەست پێدا هێنانی و ماچکردنی، لەو بیدعانەیە کە بەگوێرەی شەرع رێگری لێ دەکرێ، دەگێڕنەوە (ئەنەسی کوڕی مالیک بینی پیاوێک دەستی دانابوو لەسەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ ئەویش رێگری کردو فەرمووی: ئێمە لەکاتی پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەمان نەدەکرد) مالیک و شافیعی و ئەحمەد بە توندی ئینکاری ئەو کارەیان کردووە.[٥٤]

٣ - زانای ناودار موعەللیمی ئەلیەمانی دەڵێ: زانایانی ئەم ئوممەتە پێشینە چاکەکان و دواییینەکان کۆکن لەسەر ئەوە کە تەبەروک بەگۆڕ، بە دەست لێدان و دەست پێداهێنانی و ماچ کردنی و دانانی هەردوو چاوو هەر شێوەیەکی تر، هەموویان دوژمنایەتی کردنی خواو

---

[٥٤] -(وفاء الوفاء ٤/ ٢١٥).

پێغەمبەرەکەیەتی، و لادانە لەسەر رچەو رێبازە راستەکە، زانایان ئەو کەسانەیان یا کافر کردووە یان بەفاسقیان داناون، راستنیە، گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بەراورد بکرێ بە کەل پەل و پێویستیەکانی رۆژانەی پێغەمبەر، چونکە گۆڕ بە تایبەتی گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان زۆر گومانی ئەوەی لێ دەکرێ خەڵک توشی لادان و گومڕایی ببێ.[٥٥]

٤ - شەرعزانی مەزهەبی مالیکی ئیبن حاج دەڵێ: کەسانێک کە نەزانن دەچن تەواف بە دەوری گۆڕی پێغەمبەردا دەکەن، وەک چۆن تەواف بەدەوری کەعبەیا دەکەن، دەستی پیادێنن و ماچی دەکەن، مێزەرو جلەکانی فڕێ ئەدەنەسەری، بەمەبەستی تەبەروک، ئەم کارانە هەموویان لە بیدعەکانن، چونکە تەبەروک بەشوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ دەبێ، بێگومان هۆی پەرستشی نەفامی بۆ بتەکان هەر لەم رێگانەوە پەیدابووە.[٥٦]

---

٥٥ - (آثار الشيخ المعلمي ٤/٢٥٥).
٥٦ -(المدخل ١/ ٢٦٣).

٥ - شێخ خەلیل لە مەزهەبی مالیکی قسەکانی لەشێوەی قسەکانی ئیبن حاجە (مناسك الحج للشيخ خليل، ص: ١٦٤).

٦ - ئیمامی غەزالی دەڵێ: سوننەت نیە دەست بدرێ لە دیوارو ماچ بکرێ، بەڵکو لە دوورەوە راوەستان نزیکترە باشترە بۆ رێزگرتن.[٥٧]

٧ - ئیمامی نەوەوی کە ناسراوترین زانای مەزهەبی شافیعیە لە نێو مامۆستایان و خەڵکدا، دەڵێ: کارێکی خراپ و ناپەسندە دەست هێنان بە گۆڕی پێغەمبەرو ﷺ ماچکردنی گۆڕەکەی و .... با سەرپێچی زۆرینەی خەڵکی نەخوێندەوارو ئەو کردارەکانەی ئەوان کە دەیکەن بەهەڵەتان نەبات، بێگومان شوێن کەوتن و ئیش کردن تەنها بە فەرموودە سەحیحەکان و قسەی زانایانە، نابێ روکرێتە ئەو کارانەی نەزان و نەخوێندەوارو کەسانی تر پەیدای دەکەن، هەرکەس بە خەیاڵی

---

[٥٧] -(إحياء علوم الدين ١/٢٥٩).

خۆی وابزانێ دەست لێدان و کارەکانی تر بەرەکەت زیاد دەکات، لە نەزانین و بێ ئاگاییەتی، چونکە بەرەکەت بە شتێک دەبێ کە لەگەڵ شەرعا گونجاوبێ.[٥٨]

٨ - ئیمام (تقيُّ الدِّين السبكيُّ) لە مەزهەبی شافیعی دەڵێ: بێگومان دەستدان لە قەبرو ماچ کردنی و کوڕنوش بردن لەسەری و شێوەی ئەو کارانە هەندێک نەفام دەیکەن، هەرکەسێک ئەو کارە بکات دەبێ ڕێگری لێ بکرێ و سەر زەنشت بکرێ، و فێری ئادابی سەردانی گۆڕ بکرێت.[٥٩]

---

٥٨ -(المجموع شرح المهذب ٢٧٥/٨).
٥٩ -(شفاء السقام في زيارة خير الأنام، ص: ٣١٢).

٩ - ئیمامی (السيوطيُّ الشافعيُّ) فەرمودە ناس و موفەسیرو شەرعزان و مێژوناس دەڵێ: لە بیدعەو داهێنراوەکانە، تەوافکردن بە دەوری گۆڕی پێغەمبەرو ﷺ کە ئەوە کارێکی حەڵاڵ و رێگە پێدراونیە، هەروەها لکاندنی سک و سنگ و پشت بە دیواری قەبرەکەوەو ماچ کردن و دەستدان لەو سندوقەی لای سەری هەموو ئەوکارانە نەهی لێکراوەو دروست نیە.[٦٠]

١٠ - بوهوتی حەنبەلی دەڵێ: نابێ دەست لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بدرێ و سنگی پێوە بلکێنرێ و ماچ بکرێ. (بغية الناسك في أحكام المناسك)

١١ - ئەحمەد [الطحطاويُّ] لە مەزهەبی حەنەفی دەڵێ: نابێ دەست لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بدرێ و ماچ بکرێ، ئەوکارە لە نەریتی گاورو جولەکەیە، لە ئیسلام دەستدان تەنها تایبەتە بە بەردە رەشەکەو روکنی یەمانیەوە.[٦١]

---

[٦٠] -(الأمر بالاتباع والنهي عن الابتداع ص١٨٥) .

[٦١] -(حاشية الطحطاوي على مراقي الفلاح شرح نور الإيضاح ص ٦٢٠).

زۆر لە سۆفی و رافیزەکان هەر باسی تاوان و نا دروستی دەستدان لەگۆڕۆ ماچ کردنی بکرێ یەکسەر دێن، قسەیەک دێنن و دەیدەنە پاڵ ئیمام ئەحمەدو دەڵێن ئەوەتە ئیمام ئەحمەد دەڵێ: بۆ تەبەروک دەستدان لەگۆڕو ماچ کردنی کارێکی خراپ نیە.

- دەڵێن: کتێبی (العلل ومعرفة الرجال ٤٩٢/٢) ی عبداللّەی کوڕی ئیمام ئەحمەد هاتووە عبدِ الله پرسیاری لە باوکی کردووە (الرَّجُلُ يمسُّ منبرَ النبي ﷺ ويتبرَّكُ بمَسِّه ويُقَبِّله، ويَفعَلُ بالقبرِ مثلَ ذلك، أو نَحوَ هذا؛ يُريدُ بذلك التقرُّبَ إلى الله جلَّ وعزَّ؟ فقال: لا بأسَ بذلك).

ئەم قسە لەو کتێبەدا هەیە و گومانی تێدانیە، بەڵام ئەم قسە پەرگیرەو رەددەکرێتەوە کە ئیمام ئەحمەد قسەی وای کردبێ بە چوار بەڵگەی رۆشن.

یەکەم: قوتابیەکانی ئیمام ئەحمەد جگە لە کوڕەکەی پێچەوانەی ئەوقسە لە ئیمام ئەحمەدەوە دەگوازنەوە، ئەبوبەکری (الأثرمُ) کە لە قوتابیە ناودارەکانیەتی دەڵێ: بە باوکی عبدالله م ووت: گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەستی لێ دەدیێ و دەستی پیا دەهێنرێ؟ وتی: ئاگاداری

کارێکی وانیم، وتم؛ ئەی مینبەرەکەی؟ وتی: مینبەرەکەی بەڵێ: شتی لەسەر هاتووە، پرسیاریان لە باوکی عبدالله کرد، بینیوتە کەسانی زانا لە خەڵکی مەدینە دەست لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ نەدەن و لە دورەوە بوەستن و سەلامی لێ بکەن؟ باوکی عبدالله وتی : بەڵێ، عبداللەی کوڕی عومەر وای دەکرد.[٦٢]

(أبو الفضْل صالحٌ) لە باوکیەوە - واتە ئیمام ئەحمەد - بە پێچەوانەی براکەی دەیگێڕێتەوە، دەربارەی ئەوکەسەی دەچێتە مەدینەوە دەڵێ: نابێ دەست لە دیواری گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بدات و ماچی بکات، بەڵام دەتوانرێ دەست دانرێ لەسەر شوێنی دانیشتنەکەیی و ئەو شوێنەی پێغەمبەر لەکاتی وتاردا دەستی لەسەر دادەنا.[٦٣]

- دوای ئەوەی مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ سوتا مینبەرەکانی دوایی بۆ تەبەروک نابێ -

[٦٢] - المسائل الفقهية من كتاب الروايتين والوجهين)) (٢١٥/١) لأبي يعلى الفراء (ت: ٤٥٨)، وانظر: ((المغني لابن قدامة)) (٤٧٩/٣).
[٦٣] -(مسائل الإمام أحمد بن حنبل رواية ابنه أبي الفضل صالح ٦١/٣) .

دووەم: خودی عبدالله كوڕی ئیمام ئەحمەد لە باوكیەوە گواستویەتیەوە كە بیستویەتی لە سۆفیانی كوڕی عوەینە كە ڕێگری كردووە لە دەستدان لە گۆڕو ئیمام ئەحمەد ڕەخنەی لێ نەگرتووە،

(حدَّثَني أبي قال: سَمِعتُ أبا زيدٍ حمَّادَ بنَ دَليلٍ قال لسُفيانَ بنِ عُيينةَ: كان أحَدٌ يتمسَّحُ بالقبرِ؟ قال: لا، ولا يلتَزِمُ القبرَ)

واتە: بیستم لە باوكم وتی: بیستم باوكی یەزید حەمادی كوڕی دەلیل بە سۆفیانی كوڕی عویەینەی وت: كەسێك دەست بدات لە گۆڕ دروستە؟ سۆفیان وتی: نابێ، نابێ خۆیشی پێوە بنوسێنێ.[٦٤]

سێیە: ئیمام ئەحمەد بەدروستی نازانێ دەست بدرێ لە سوچەكانی كەعبە، جگە لە بەردە ڕەشەكەو ڕوكنی یەمانی، لەبارەی حوكمی ماچ كردنی قورئان بێدەنگی هەڵبژاردووە، كە قورئان وتەی خوای گەورەیەو زۆر پیرۆزە، ئیتر چۆن بە دروستی دەزانێ دەست لەگۆڕ بدرێ و ماچیش بكرێ.

---

٦٤ -((الرد على الإخنائي)) (ص٤١٦).

ئیسحاقی کوڕی مەنسوری کوسەج دەڵێ: پرسیارم لە ئیمام ئەحمەد کرد، دەکرێ دەست لە هەموو سوچەکانی کەعبە بدرێ؟ وتی: نابێ دەستی لێ بدرێ تەنها دەست لە روکنی یەمانی و بەردە رەشەکە دەدرێ.[٦٥]

چوارەم: زانایانی شوێنکەوتووی ئیمام ئەحمەد دەستدان لە گۆڕو ماچ کردنی بە دروست نازانن و رێگریان لێکردووە، بێگومان ئەوان لە هەمووکەس زیاتر شارەزای بۆچوونەکانی ئیمام ئەحمەدن، هەتا کەسیان ئەوگێرانەوەی عبدالله کوڕی ئیمام ئەحمەدیان لە کتێبەکەیاندا باس نەکردووە.

---

[٦٥] -(مسائل الإمام أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهويه ٥/ ٢٣٢٨)

- بۆ بەرچاو ڕوونی بۆچوونی زانایانی مەزهەبی ئیمام ئەحمەد بگەڕێنەوە بۆ ئەم کتێبانە (المغني ٤٦٨/٥) + (الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف ٥٣/٤) + (المبدع في شرح المقنع لابن مفلح ٢٣٧/٢) + (كشاف القناع للبهوتي ٥١٧/٢)

جگە لەم کتێبانە بەدەیان کتێبی تری ئەم مەزهەبە.

هەرکەس شارەزای مەزهەبی ئیمام ئەحمەدبێ دەزانێ خاوەنی ئەم کتێبانە ناسراوترین پێشەوای ئەم مەزهەبەن، ئەوان خاوەنی لێکۆڵینەوەو تەسحیح و تەنقیحن و ئەوان شارەزاترن لە بۆچون و فەتوای ئیمام ئەحمەد، کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودە دێنم نافیع دەیگێڕێتەوە کە عبداللەی کوڕی عومەر هەرکات لەسەفەر بهاتایەوە سەرەتا سەردانی گۆڕی پێغەمبەری ﷺ دەکردو سەلامی لێ دەکردو سەڵاواتی لەسەر دەداو بۆی دەپاڕایەوەو دەستی لە گۆڕەکەی نەدەدا، پاشان سەلامی لە ئەبوبەکرو عومەر دکرد.[٦٦]

---

[٦٦] -( رواه البيهقي في شعب الإيمان ٤١٥٠).

## جۆری دووەم: لە جۆرەکانی تەبەروک:

هەندێک شوێن هەیە پیرۆزن، پیرۆزیەکەیان پەیوەستە بە عیبادەت و پاداشتەوە، شەرع ڕێی نەداوە تەبەروکی پێ بکرێ، بەو شێوەی خەڵک دەیکات.

ئەو شوێنانەی خوای گەورە بە پیرۆزی داناون:

- مزگەوتەکان پیرۆزترین شوێنن بە تایبەتی ئەو سێ مزگەوتەی لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد، المسجد الحرام، ومسجدي هذا، والمسجد الأقصى) واتە: سەفەری تایبەت مەکەن بۆ هیچ شوێنێک بۆ نوێژو عیبادەت تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ، مسجد الحرام و ئەم مزگەوتەی من (المسجد النبوی) و مزگەوتی ئەقسا.

- یەکێکی تر لەو مزگەوتانەی پیرۆزن بۆ عیبادەت کردن تێیدا مزگەوتی قوبایە، وەک لە فەرموودەدا هاتووە: (من تطَهَّرَ في بيتِهِ, ثمَّ أتى مسجدَ قباءٍ، فصلَّى فيهِ صلاةً، كانَ لَهُ كأجرِ عمرةٍ)[٦٧]

زانایان دەفەرموون: ئەگەر کەسێک لە مەدینەبێ و رۆژی شەممە دەست نوێژ بگرێ و بچێ بۆ مزگەوتی قوبا لەوێ دوو رکات نوێژ بکات ئەو پاداشتە گەورەی دەست دەکەوێ.

تەبەروکی ئەم مزگەوتانە هەڵگرتنی گل، و دەست و دەم و چاو هێنان نیە بەگڵ و دارو بەردو دیواری ئەم مزگەوتانە، بێگومان تەبەروک کردن بەشت عیبادەتە عیبادەتیش دەبێ بە گوێرەی شەریعەت و شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ بێ، بەدەست هێنانی بەرەکەت لەم مزگەوتانە بە مانەوەو نوێژو چاوەڕێی نوێژی داهاتوو نوێژی بە کۆمەڵ و ئامادە بوونی دەورەی دەرس و ئامۆژگاری و زیکر دەبێ تیایاندا، خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ:

---

٦٧ - رواه أحمد والترمذي وصححه السيوطي، والالباني

[فِي‌بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ * رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ]

لە ئایەت و فەرموودەکاندا باسی تەبەروک بە گڵ و دیوارو بەردی ئەم مزگەوتانە نەکراوە، بەڵکو تەبەروک بەو مزگەوتانە بریتیە لە عیبادەت و نوێژکردنی زۆر تێیاندا، هەندێک کە دەچن بۆ حەج یا عەمرە دەچن گەنمی بەردەم کۆترەکانی (بیت الحرام) وەک تەبەروک کۆدەکەنەوەو دەی هێننەوە بۆماڵەوە دەرخواردی کەسی خۆیانی دەدەن، بۆ چاک بونەوە لە نەخۆشی یا بۆ منداڵ بوون، ئەوە کارێکی حەرام و ناشەرعی و نارەوای ئەنجام داوە، بەراستی تەنها لە کەعبەدا بەردە رەشەکە دروستە ماچ بکرێت دەستی لێ بدرێ و روکنی یەمانی دەستی لێ درێ، ئاوی زەمزەمیش پیرۆزە بۆ خواردنەوە دەبێ بۆ هەر نێتێکبێ، جگە لەمانە هیچی پیرۆزی تیانیە لەگەڵ خۆت بیهێنیتەوەو بەناوی موفەڕک و پیرۆزی دەرخواردی کەسی بدەی، جاران کاتێک حاجی دەهاتەوە ناودەستی دەگرت بۆ ئەوەی خەڵک ماچی بکات

گوایە دەستی لەبەردە ڕەشەکە داوەو پیرۆزی بەردە ڕەشە بەدەستیەوە ماوە، لە کاتێکدا بە هیچ شێوەیەک دەست و هیچ شتێکی تر بە بەرکەوتنی بەردە ڕەشەکە پیرۆزنابێ، جگەوە لەوە ئەم حاجیە تا گەشتۆتە ماڵەوە چەندین جار دەستی بە ئاو گەیاندبوو، چەندین جار شۆردبوی، بێگومان دەتوانم بڵێم لە سەدا نەوەدو نۆشی دەستی لەو بەردە نەدرابوو، بەڵام بوبووە عادەت کە دەچووی بۆلای حاجی هەندێجار ماچ کردنی ناودەستی بوبووە ئیجباری، گوایە دەستی لەبەردە ڕەشەکە داوە.

- لەو شوێنانەی گەورەو بەڕێزە لای خوای گەورە شاری مەککەیە، ئیبراهیم پێغەمبەر علیه السلام پاڕایەوە لە خوا تا بەرەکەت بخاتە ئەو شارەوە، مەککە کەعبەی تیایە کە خۆشەویسترین و بەڕێزترین شوێنە لەسەر زەوی، نوێژ لەو مزگەوتەدا خێری سەد هەزار نوێژی مزگەوتی تری هەیە.

- یەکێکی تر لەو شوێنانە شاری مەدینەیە، پێغەمبەر ﷺ پاڕاوەتەوە بۆ پیرۆز بوونی شاری مەدینە، خوای گەورە پاڕانەوەکەی وەرگرتووەو ئەوشارەش پیرۆزەو نوێژکردن لە مزگەوتی پێغەمبەر بەهەزار نوێژی مزگەوتەکانی ترە.

لەو مزگەوتەدا شوێنێکی تێدایە لە کاتی سەردانی مزگەوتەکە سوونەتە دوو رکات نوێژی تێدا بکرێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ)[٦٨] نێوان خانووەکەم و مینبەرەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت.

- یەکێکی لەو شوێنە پیرۆزانە ناوچەی شامە، خوای گەورە دەفەرموێ: [سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ] الإسراء نوێژ لەم مزگەوتە بە پێنج سەد نوێژی مزگەوتەکانی ترە.

[٦٨] - رواه البخاري (١١٩٦) ومسلم (١٣٩١)

مەبەستی لە (حَوْلَهُ) شامە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆش بەختی بۆ شام، وترا بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی: فریشتەکان باڵیان بەسەریدا راخستووە.[٦٩]

- هەندێک شوێن لەکاتی جێ بەجێ کردنی دروشمە پیرۆزەکانی ئاینی ئیسلامدا پیرۆز دەبن، وەک کێوی عەرەفەو موزدەلیفەو مینا، چونکە لەکاتی بەجێ هێنانی دروشمەکانی حەج لەو شوێنانەدا، بەرەکەتی خوای گەورە دەبارێتە سەرخەڵک، ئەو شوێنانە کاتێکی دیاری کراو پیرۆزن، لەبەر ئەوەیە ئەگەر جگە لەوکاتەدا کەسێک بچێت لەو شوێنانەدا عیبادەت بکات بەنیەتی بەرەکەت و پاداشتی زۆر، کارێکی بیدعە کردووە، یا کەسێک بچێ لە عەرەفە راوەستێ بەنیەتی بەرەکەت و پیرۆزی ئەوە کاری بیدعەی ئەنجام داوەو پاداشتی دەستناکەوێ بەڵکو گوناح باردەبێ چونکە کاری بیدعەی کردووە، هەرکەس بچێت بۆ عەرەفەر بچێتە سەرکێوی عەرەفە بەنێتی پیرۆزی کێوی عەرەفە، بێگومان کارێکی حەرام و بیدعەی ئەنجام داوە، دەبێ

[٦٩] - رواه احمد

ئەوەش بزانین ئەو شوێنانەش لەکاتی حەجدا تەنها بۆ نوێژو پاڕانەوەو بەجێهێنانی مەراسیمەکان پیرۆزن، بەردو دارو گڵ و دیواری ئەو شوێنانە پیرۆزنین و تەبەروکیان پێ ناکرێ، هەرکەس کارێکی وابکات تاوانبار دەبێ.

خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی رازی بێ، دەرسێکی عەقیدەی جوانمان فێردەکات و پێمان رادەگەیەنێ دەستدان لە بەردە رەشەکەو ماچکرنی ناتوانێ سودمان پێ بگەیەنێ، ئەو ماچ کردنە، تەنها سوننەتێکە وەک شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ دنیا هیچ سودێکی نیە (عَنْ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ يُقَبِّلُ الْحَجَرَ وَيَقُولُ: إنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لَا تَضُرُّ وَلَا تَنْفَعُ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ)[٧٠] لە عومەرەوە کاتێک بەردەکەی ماچ کرد دەیووت: من دەزانم تۆ نە سوودت هەیە نەزەرەر، ئەگەر نەمبینایایە پێغەمبەر ﷺ ماچی کردی ماچم نەدەکردی.

---

[٧٠] - رَوَاهُ الْجَمَاعَةُ

ئەم فەرموودە ئەوەمان پێدەڵێ دەستدان لەو بەردەو ماچ کردنی نەخۆش چاک ناکاتەوەو منالّیش نابەخشێ بەکەس، باشە ئەگەر بەردێک ماچ کردن و دەست لێدانی سوونندت بێ، چەندین فەرموودەی لەسەربێ، پێغەمبەر ﷺ ماچی کردبێ خەلیفەکان و هاوەڵان و ئەولیاکان و زانایان و بە ملیارِان خەڵک ماچیان کردبێ، لەگەڵ ئەوە نەتوانێ سوودو زیانی دونیایی بەکەس بگەیەنێ، باشە گۆڕو بەردی سەر گۆڕو گڵەکەیی و گومەزی سەرگۆڕی پیاو چاکێک چۆن دەتوانێ زیان و سودی بۆ کەس هەبێ، لەکاتێ دەست لێدان و ماچ کردنی ئەو گۆڕو بەردانە پێچەوانەی فەرموودەو فەتوای زانایانی ئوممەتی ئیسلامیە، نازانم خەڵکێک بۆ بەوردی بیر لەوە ناکەنەوە، قسەی زانایانمان هێنا کە بەتایبەتی باسی نارەوایی ماچ کردنی گۆڕو بەردو گڵ و دیواری گۆڕی پێغەمبەریان کرد، باشە گۆڕی ئەو پیاچانە گەورەترو پیرۆزترە لە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ ؟؟!!

- کۆتا شوێن کە ئاماژە بە پیرۆزیەکەی بکەین:

١ - شیوی عەقیقە لە مەدینە بوخاری لە سەحیحەکەیدا لە عبداللەی کوورِی عومەرەوە دەگێرِێتەوە دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ لە شیوی عەقیق دەیفەرموو: ئەمشەو نێردراوێک لەلایەن پەروەردگارمەوە هات وتی: نوێژ لەم شیوە موبارەکەدا بکەو ئیحرام بەعەمرەو حەج ببەستەو بڵێ: عومرە لەحەجدا

٢ - شیوی (طوی) ئەو شوێنەی خوای گەورە قسەی لەگەڵ موساکرد (فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ * فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ مِنْ شَاطِئِ الْوَادِ الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَنْ يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ)[٧١]

[٧١] - القصص: ٢٩-٣٠

ئەم شوێنانە بەلای پەروەردگارەوە بەڕێزن خوا خۆی ئەو ڕێزەی پێ بەخشیون، بەڵام ناکرێ بەبێ هیچ بەڵگەیەکی شەرعی تەبەروک بەو شوێنانە بکرێ، چونکە ئێمە دەبێ پابەندی بڕیارو فەرمانەکانی خوابین، ئەم شەریعەتی ئیسلامە بێ خاوەن نیە، خوا خۆی خاوەنیەتی دەبێ بڕیاری عیبادەت و خواناسیمان لە پەروەردگارمانەوە وەرگرین.

## جۆری سێیەم : گەورەو بەڕێزی هەندێک مانگ و ڕۆژو کاتی تایبەت لە ئیسلامدا:

هەندێک کات هەیە خوای گەورە پیرۆزی کردوون و ڕێزی داون بەسەر کاتەکانی تردا، کاتە پیرۆزەکان لە هەموویان پیرۆزتر مانگی ڕەمەزانە، بێگومان هەندێک کات هەیە خوای گەورە لە کاتەکانی تر جیای کردونەتەوەو پیرۆزی کردوون. ئێمە لێرە بەکورتی ئاماژە بە هەندێک لەو کاتانە دەکەین،

لەو کاتانە:

- مانگی ڕەمەزان لە هەموو مانگەکانی تر پیرۆزترە، وەک لە فەرمووددەدا هاتووە: (أتاكم شهرُ رمضانَ، شهرٌ مبارَكٌ، فرض اللهُ عليكم صيامَه، تفتحُ فيه أبوابُ الجنَّةِ، و تُغلَق فيه أبوابُ الجحيم، وتُغَلُّ فيه مَرَدَةُ الشياطينِ، وفيه ليلةٌ هي خيرٌ من ألف شهرٍ، من حُرِمَ خيرَها فقد حُرِمَ)

- شەوی لەیلەتول قەدر کە دەکەوێتە مانگی رەمەزانەوە، گەورەترین شەوەکانی ساڵە، عیبادەت کردن لەو شەوەدا وەک عیبادەتی زیاتر لە ٨٣ ساڵە.

خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ (الدخان) (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ)

- رِۆژی جومعە (قال النبي ﷺ: خير يوم طلعت عليه الشمس يوم الجمعة)

- رۆژی عەرەفە: قال رسول الله ﷺ (مَا مِنْ يَوْمٍ أَفْضَلُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، يَنْزِلُ اللَّهُ تَعالَى إلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا فَيُبَاهِي بِأَهْلِ الْأَرْضِ أَهْلَ السَّمَاءِ) بەرِۆژو بوون لە رۆژی عەرەفەدا دەبێتە کەفارِەتی تاوانی بچوکی دووساڵ،

- دە رۆژەی سەرەتای مانگی (ذي الحجة)

- رۆژی دووشەم و پێنجشەم:

- سێیەکی کۆتایی هەموو شەوێک.

- نۆو دەیەمین رۆژی مانگی محەڕەم، بەرۆژوو بوونی دەی مەحەڕەم دەبێتە کەفارەتی تاوانی بچوکی ساڵێک، وەک لە فەرموودەدا هاتووە.

- بەڕۆژوو بوونی شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال

- ئەو چوار مانگەی لە قورئاندا باسکراوە، ذو القعدة وذو الحجة والمحرم ورجب) [وەک بوخاری و مسلم لە ئەبی بەکرەوە دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الزمان قد استدار كهيئته يوم خلق الله السموات والأرض، السنة اثنا عشر شهراً منها أربعة حرم، ثلاثة متواليات: ذو القعدة وذو الحجة والمحرم، ورجب، شهر مُضر، الذي بين جمادى وشعبان] بێگومان عیبادەت لەم چوار مانگەدا خێری زیاترە لە مانگەکانی تر جگە مانگی رەمەزان، هەرکەسێک کاتێک بە پیرۆز بزانێ جگە لەو کاتانەی لە قورئان و سوونەتدا بە پیرۆز دانراوە، ئەوە کارێکی بیدعەی کردووە، پێویستە لەسەر موسڵمان خۆی بپارێزێ لە بە پیرۆز دانان و عیبادەتی تایبەت لەو کاتانەدا کە لە شەریعەتدا بە پیرۆز دانەنراوە،

زانای ناودار (أبو شامة المقدسي) دەڵێ: نابێ عیبادەت تایبەت کرێ بەکاتێکەوە کە شەرع تایبەتی نەکردوە، بەڵکو هەموو چاکەکاریەک لە هەموو کاتێکدا دەکرێ، هیچ کاتێک بەرێزترنیە لە کاتەکانی تر، تەنها ئەوکاتانە نەبێ شەرع رێزی پێداون و تایبەتی کردوون بە جۆرێک لە عیبادەت تێیدا، ئەگەر ئەو بەڕێزو گەورەییە درا بە کاتێک بۆ عیبادەتێکی تایبەت وەک رۆژوی رۆژی عەرەفە و دەی موحەڕەم، یا شەونوێژ لە کۆتایی شەوداو عومرە لە مانگی رەمەزاندا، نابێ عیبادەتی تری تێدا بەگەورە بگیرێ، هەندێک کات هەیە هەموو جۆرە عیبادەت و خێرو چاکەیەک تێیدا گەورەیەو پاداشتی زۆرە، وەک دەی (ذي الحجة) شەوی (ليلة القدر)، بۆ کەس نیە سەربەخۆ کاتێک تایبەت بکات بە عیبادەتێکی تایبەت و پێی وابێ ئەوکاتە بەڕێزەو عیبادەت تێیدا خێری زۆرە.[٧٢]

---

٧٢ -(الباعث على إنكار البدع والحوادث ص ٧٧) .

## بە گەورەگرتنی مانگ و ڕۆژەکان:

لەکاتێکدا کاتی ئیسراو میعراج بەتەواوی نازانرێ و زانایان لە دیاری کردنی ساڵەکەو مانگەکەش بۆ چوونی جیاوازیان هەیە، چ بگات بە شەوەکەی، هەر توێژەرێک بە ویژدانبێ دەزانێ بێتوانایە لە دیاری کردنی مێژووی ئیسراو میعراجی پێغەمبەر ﷺ چونکە ئەوشەوە یەکلا نەکراوەتە چ شەوێکە، هیچ هاودەنگیەک نیە لە نێوان زانایاندا لەسەر دیاری کردنی مێژووەکەی ئیبن دوحیەی کەلبی دەڵێ: هەندێک لە چیرۆک گێڕەوەکان باسیان کردووە کە ڕووداوی ئیسراو میعراج لە مانگی ڕەجەبدا بووە، ئەم قسە بەلای زانایانی جەرح و تەعدیل درۆیەکی تەواوە، پیاوانی سەنەدەکە ناسراون بەدرۆزن ئەبو ئیسحاقی حەربی دەڵێ: شەوی ٢٧ی ڕەبیعول ئەوەل شەوڕەوی بە پێغەمبەر ﷺ کراوە،[٧٣]

---

[٧٣] -(أداء ما وجب من بيان وضع الوضاعين في رجب ص ٥٣-٥٤).

ئیمام تقي الدين سبوکی دەڵێ: ئاهەنگ گێڕان نیە بەو شێوەی لە (التذکرة الحمدونية) دەڵێ: شەورەوی پێغەمبەر ﷺ لەمانگی رەجەبدا بووە، میسریەکان شەوی ٢٧ی رەجەب زیندو دەکەنەوە بەو بۆنەوە، ئەوکارە بە نەزانین رێک خراوە.[٧٤]

بە دەیان گەورە زانای ناودار وتویانە ئیسراو میعراج لە مانگی رەجەبدا نەبووە، لەو زانایانە علی کوڕی ئیبراهیم کوری داودی شافیعی، و ئیبن تەیمیە، مێژو نوسی گەورە ئیبن کەسیر لە (البداية والنهاية ٤/٢٧٠) ئین رەجەبی حەنبەلی (لطائف المعارف"ص ١٤٠) .

ئەوە قسەی زانایانە لەسەر ئەو رووداوە مێژوویە.

باشە ئەو خەڵکەی ئێستا بە چ بەڵگەیەک دێن لە ٢٧ی مانگی رەجەبدا ئاهەنگ دەگێڕن بەبۆنەی یادی ئیسراو میعراج، خۆ ئەگەر گریمان راستبێ لەوکاتەدا روویدابێ، بەچ بەڵگەیەک ئەو شەوە پیرۆز دەکەن، بێگومان ئەگەر پیرۆز بوایە خوای گەورە یا پێغەمبەر ﷺ

---

[٧٤] -(السيف المسلول على من سب الرسول ﷺ ص ٤٩٢)

کاتەکەیان دیاری دەکردو باسی پیرۆزیەکەشیان دەکردو هاوەڵان و تابیعین گرنگیان پێدەدا،

- دیاری کردنی رۆژێک لە مانگی رەجەب و بەرۆژوو بوون تێیدا و نوێژو عیبادەت کردن لە شەوەکەیدا، کارێکی بیدعەیەو نە پێغەمبەر ﷺ کردویەتی نەهاوەڵان و تابیعین کردویانە باشە کێ لەمانە خواناسترە،

- زیندوکردنەوەی شەوی پانزەی مانگی شەعبان بە شەو نوێژو عیبادەت و بەرۆژوو بوونی رۆژەکەی. یا هەرکات و وەختێکی تر کە بەڵگەی راست و دروستی لەسەرنەبێ دروستنیەو بیدعەیە.

چونکە ئەو فەرموودە: (إذا كانت ليلة النصف من شعبان فقوموا ليلها وصوموا نهارها فإن الله ينزل فيها لغروب الشمس إلى سماء الدنيا، فيقول ألا من مستغفر فأغفر له، ألا مسترزق فأرزقه، ألا مبتلى فأعافيه، ألا كذا ألا كذا حتى يطلع الفجر) کە باسی شەو نوێژکردن لە شەوی پانزەی شەعبان و بەڕۆژوو بوونی ڕۆژەکەی دەکا فەرموودەیەکی دروستکراوەو هیچ بنچینە و بنهایەکی نیە، (سەنەدی فەرموودەکە ئیبن

ئەبی سەبرەی تیایە لەو کەسانەی تاوانبار کراوە بە دروستکردنی فەرمووده، ئیبراهیم کوڕی محمدیش لای کەمیەکەی حاڵی نادیارە، کەواتە فەرموودەکە زۆر لاوازە ئەگەر نەڵێین هەڵبەستراوە)

خوای گەورە دەفەرموێ: [الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي] واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەم بۆ تەواوکردن نیعمەت و بەخششی خۆم تەواوکرد بۆتان.

هەرکەس شتێک لە دیندا زیاد بکات بە زمانی حاڵ یەکێک لەم دووشتانە دەڵێ: یا دەڵێ: نعوذ بالله سیقەم بەو ئایەتە نیەو نەخێر خوا ئایینەکەی تەواو نەکردووە ئێمە تەواوی دەکەین، یا دەڵێ: پێغەمبەر خیانەتی کردووەو هەندێکی نەکردووە، یا بە ئێمەی ڕانەگەیاندووەو ئێمە دەکەین و ئایینەکە تەواو دەکەین.

خۆشەویستان پابەندبونمان بە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە ﷺ گەورەترین سەرمایەیە بۆ دونیا دوارۆژمان با واز لە زیاکردن و بیدعەو داهێنان لە ئایندا بێنین، خوای گەورە دەفەرموێ:

[لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا] باشە بۆچی لەگەڵ باسی عیبادەتێک یا کارێک لەدیندا دەکەی پێت دەوترێ ئەوە دروست نیەو بیدعەیە مەیکە و وازی لێ بێنە؟ دێی بۆ سەلماندن و شەرعیەتدان بەکارەکەت لە باتی ئایەت و فەرموودە دێی قسەو کرداری فڵان فیسار زانا دێنی لە کوێدا خوای گەورە فەرموویەتی قسەو کرداری فڵان و فیسار رەوشتی جوانن بۆ ئێوەو شوێنی بکەون.

## چەند خاڵێکی کورت و گرنگ لەسەر تەبەروک..!

لەکۆتا زنجیرەکانی باسی تەبەروک دەمەوێ رونکردنەوەیەکی گرنگ بدەم، تاوەکو بەهەڵە لە تەبەروک حاڵی نەبن و وانەزانن ئێمە لە زنجیرە باسی تەبەروکدا وتومانە هەموو جۆرەکانی تەبەرووک شیرکی گەورەن و هەرکەسێک بەهەر نێتێک تەبەروک بکات و باوەڕی بە دروستی تەبەروک هەبێ دەبێتە موشریک، هەرکەسێک وابڵێت و قەناعەتی وابێ بەراستی بێ ئینسافی کردووە، چونکە لە زنجیرە پۆستەکانی تەبەروکدا بەرۆشنی دەردەکەوێ، من چیم وتووە، بێگومان شیرکی گەورەو بچووک هەیە، شیرکی بچوک چەندین جۆری هەیە، وەک چۆن شیرکی گەورە چەندین جۆری هەیە،

شیرکی تەبەروک لەم چەند خاڵە کورت دەکەینەوە

١ - ئەو سۆفی و دەروێش و خەڵکە نەزانە ئەوەی دەیکەن لە سەردانی گۆڕی ئەولیاو پیاو چاکان و دەستی پیا دێنن و باوەڕیان وایە گۆڕی ئەو پیاوچاکانە سودیان پێدەگەیەنێ و بەرەکەتیان هەیە، ئەگەر

باوەڕیان وابێ گۆڕەکەو خاوەنی گۆڕە لە خۆیدا پیرۆزو موبارەکەو دەتوانێ سوود بگەیەنێ بەوانەی سەردانی دەکەن، ئەوە شیرکی گەورەی کردووەو ئەگەر دوای ئامۆژگاری کردن و تێگەیاندنی تەوبە نەکات و بەردەوامبێ لەسەری دەبێتە موشریک، ئەگەر نوێژ و شەو نوێژو عیادەتەکانی تریش بکات.

٢ - ئەگەر لەکاتی سەردانی کردنی گۆڕی ئەو پیاوچاکانە دەستی پیا بێنن و باوەڕیان وابێ گۆڕی ئەو پیاوچاکانە بەرەکەتاوین و سودی هەیە بۆ ئەو کەسانەی سەردانیان دەکەن، بەڵام باوەڕی وانیە ئەم سودە هی گۆڕو خاوەن گۆڕەکەیە بەڵکو باوەڕی وایە خوای گەورە ئەو بەرەکەتەی ناردۆتە سەر ئەو گۆڕو خاوەن گۆڕە، ئەم بیروباوەڕە شیرکی گەورەنیە، بەڵام ڕێخۆشکەرە بۆ شیرکی گەورە، لەبەر ئەوە دەبێ موسڵمان زۆر ئاگاداربێ لەوکارو بیرو باوەڕە نامۆیە خۆی دووربگرێ، و بەرگری لەکاری وانەکات.

٣ - هەرکەس تەبەروک بە دروستکراوێک لە دروستکراوەکان بکات، جا گۆڕبێ و یا درەخت، یا بەرد، یا ئینسانی زیندو یا مردوو، باوەڕی وابێ ئەو دروستکراوە خۆی خاوەنی ئەو بەرەکەتەیە، یا ئەو دروستکراوە دەتوانێ تکای بۆ بکات و لە خوا نزیکی بکاتەوە، ئەمکارە بە شیرکی گەورە دادەنرێ و هاوشێوەی کرداری موشریکەکانە کە لەگەڵ بتەکان دەیانکرد، لە شێوەی ئەوەدا فەرموودەی (أبي واقد الليثي) هاتوە، موشریکەکان بۆ پیرۆزی سیلاحەکانیان هەڵدەواسی بە درەختێکەوە، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەر درەختێک بۆ ئێمە دیاریکە تا ئێمەش وەک ئەوان کەین، پێغەمبەر ﷺ ئەو قسە وەک شیرکی گەورە حسابی بۆ کرد بۆیە فەرمووی: سُبْحانَ الله قسەکەتان وەک قسەکەی بەنی ئیسرائیل وایە کە وتیان: [اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ][٧٥]

٤- هەر کەس تەبەروک بەدروستکراوێک بکات و باوەڕی وابێ بەو تەبەروکە لە خوا نزیک دەبێتەوە بەڵام لەگەڵ تەبەروک پێکردنی

[٧٥] - فەرموودەکە ئەحمەدو نەسائی گێڕاویانەتەوە.

باوەڕی وانیە ئەو شتە دەتوانێ زەرەر یا سودی پێ بگەیەنێ، وەک تەبەروکی نەزانەکان بە پەردەی کەعبەو دەستدان لە دیواری کەعبەو مەقامی ئیبراهیم و ژورەکەی پێغەمبەرو پایەکانی مزگەوتی حەرەم و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، بەو مەبەستە کە خوای گەورە پیرۆزی کردووە، ئەم شێوە تەبەروکە بە بیدعە دادەنرێ و رێ خۆشکەرە بۆ دروست بوونی شیرکی گەورە.

٥- ئەو قسەی کە کەسێک بە کەسێکی تر دەڵێ: دانیشە مەجلیسەکەمان پیرۆزکە، پێویستە موسڵمان خۆی لێ بپارێزێ، ئەگەر کەسێک وتی: دەبێ بزانین مەبەستی چیە، ئەگەر مەبەستی ئەوەبوو ئەوکەسە خۆی پیرۆزەو بە دانیشتنی ئەو مەجلیسەکە پیرۆز دەبێ، ئەوە قسەیەکی حەرام و ناشەرعی وتووە، شیرکی گەورەنیە، ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ بەدوعاو زیکرو سەڵاوات و ئامۆژگاری مەجلیسەکە پیرۆز بکات، قسەکەی دروستەو ناشەرعی تیانیە.

٦ - هەڵگرتنی قورئان لە ماڵ و سەیارەو دوکان و .. تەنها بۆ تەبەروک و پاراستنی ماڵ و منداڵ بێ، کارێکی بیدعەو ناشەرعیە دەبێ خۆمانی لێ بە دوور بگرین.

٧ - دانانی قورئان لە پشت سەری ئافرەتێک کە تازە مناڵی بووە، بە مەبەستی پاراستنی ئافرەتەکە، یا کاتێک کەسێکی خۆشەویست دەچێ بۆ سەفەر یا بۆ شوێنێک، قورئان بگری بەدەستەوەو بڵێی بەژێریا برۆ یا قورئانەکە بەسەریا بسوڕێنی، یا هەڵگرتنی قورئان و گێرانی بە دەوری مردو یا گۆڕ، ئەمانەو چەندین شتی تری لەم شێوانە، کارێکی حەرام و ناشەرعیەو هیچ سودی بۆ کەسەکەش نابێ.

٨ - با زۆر لەخۆمان رازی نەبین و وریای خۆمان بین و خۆمان لە شیرکی بچوکیش بپارێزین ئەوەندەی بۆمان دەکرێ، لە خوا بپارێینەوە لەو شتانەی شیرکەو پێمان نەزانیوە لێمان خۆشبێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لاَ أَعْلَمُ) با ئەم دوعایە زۆر بکەین.

٩ - ماچ کردنی دەست یا قاچ: هەندێک لە زانایان دەڵێن: ئەگەر نەکرێتە عادەت ونەریت زۆر بە کەمی کەسێک دەست هەتا قاچی زانایەکی گەورە ماچ بکات، بە چەند مەرجێک دروستە:

- لەبەر ڕێز بۆ زانستەکەی ماچی بکات.

- دەبێ زۆر بەکەمی شتی وابکات.

- نابێ وەک تەبەروک ماچی بکات، وەک سۆفی و دەروێشەکان دەست، هەندێکیان دەست و قاچی شێخەکەیان بۆ تەبەروک ماچ دەکەن.

ئەو زانایانە بۆ قسەکەیان هیچ بەڵگەیەکی شەرعیان نیەو خۆ دوورگرتن لەماچ کردنی قاچ زۆر باشە هەتا قوتابیش قاچی مامۆستاکەی ماچ نەکات باشە، بەڵام ماچ کردنی دەست دروستەو بەڵگەی لەسەرە، ئەوەش زۆر بەکەمی.

بێگومان ماچ کردنی دەست و قاچ بۆ تەبەروک شیرکی بچوک و تاوانی گەورەیە، هەندێکجار دەبێتە شیرکی گەورەش، بێگومان ئێستا بۆتە خوو نەریت، هەندێک شێخ والە موریدەکانیان دەگەیەنن خەڵک

لە گرنگی ماچ کردنی دەست و قاچی شێخ حاڵی نەبوون و نازانن، هەڵیان دەنێن لەسەر ئەوکارە.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوە کە هەموو جسم و جل و پێڵاو موو کەرەستەکانی ق بووە، بەکەمی هاوەڵان دەستیان ماچ کردووە، فەرموودەیەکی سەحیح نەهاتووە بڵێ هاوەڵێک قاچی پێغەمەری ﷺ ماچ کردوە، هەندێک فەرموودە هەیە کە ئیمام عەلی دەست و قاچی عەباسی مامی ماچ کردووە، هەموو ئەو فەرموودانە لاوازن و بەهیچ شێوەیەکک نابێتە بەڵگەی دروستی ماچ کردنی قاچی شێخ.

پێغەمبەر ﷺ جارێک لە ژیانیدا دانەنیشتووە دەستی گرتبێ و هاوەڵان بەریز وەستابن دەستیان ماچ کردبێ، بەداخەوە لەکۆن و تازەدا هەندێک بەناو شێخ دادەنیشن رێگە دەدەن بە موریدەکانیان بێن یەکجار دەستی یا قاچی ماچ بکەن و بۆی نیە بیکا بە دووجار بۆ ئەوەی شێخ هیلاک نەبێ.

بێگومان ئەم کارە لە ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام و ڕەوشتی ئەولیاو پیاوچاکانەوە زۆر دوورە، کارێکی حەرام و نادروستەو زەلیل و زەبوون کردنی خەڵکی گێژو داماوو نەزانە، پێویستە مامۆستایان لەسەر زەلیل و ریسواکردنی خەڵک بێ دەنگ نەبن، ئیسلام هاتووە ڕێزو شکۆ بکێڕێتەوە بۆ خەڵک، تەنها زەلیلی و ملکەچیان بۆ خوابێ.

١٠ - بەڕێزان و خۆشەویستان یەکێک لەو فەرموودانەی کە هەندێک لە سۆفی و دەروێشەکان زۆر باسی دەکەن و دەیکەنە بەڵگەی بیدعەو شیرک و کارە ناڕەواکانیان ئەو فەرموودەیە کە گوایە کاتێک معاز لە شام گەڕاوەتەوە سوجدەی بۆ پێغەمبەر ﷺ بردوەو، دەڵێن: کاتێک معاز سوجدەی برد بۆ پێغەمبەر ﷺ پێی نەفەرموو تۆ موشریکی، لەوەڵامدا دەڵێین: ئەگەر فەرموودەکە راست و سەحیحبێ نابێتە بەڵگە بۆ دروستی کارێکی ناشەرعی، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەرەزامەندی بۆ کارەکەی دەربڕی و نە بێدەنگ بوو بەڵکو ناڕەزایی دەربڕی، ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە ئەو فەرموودە دەبێتە

بەڵگەی پاکانە بۆ کەسێک کە شتێکی ناشەرعی بکات و نەزانێ ناشەرعیە تاوانبار نابێ، لەگەڵ ئەوانە ئەو فەرمووده کە ئەمە دەقەیەتی (لما قدم معاذ من الشام, سجد للنبي ﷺ قال: ما هذا يا معاذ ؟ قال: أتيت الشام, فوافقتهم يسجدون لأساقفتهم وبطارقتهم، فوددت في نفسي أن نفعل ذلك بك، فقال رسول الله ﷺ: فلا تفعلوا .... ) ئەم فەرمووده زۆر لاوازەو راست نیە معاز سوجدەی بۆ پێغەمبەر ﷺ نەبردووە، یەکەم: سابت نەبووە معاز لەکاتی پێغەمبەردا ﷺ چوبێ بۆ شام، ئەوەی بە سابتی هاتووە معاز لەکاتی خەلافەتی عومەر چووە بۆشام لەوێ بە تاعون مردووە، لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا ﷺ معاز چووە بۆ یەمەن، کاتێک پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە ئەو لەیەمەن بووە، لەکاتی خەلافەتی ئەبوبەکر گەڕاوەتەوە.

دووەم: معاز لە گەورە هاوەڵ و شەرعزانانی پێغەمبەر بووە ﷺ زۆر لەو دوورە ئەوەندە نەزانبێ کارێکی وابکات.

سێیەم: ئەو فەرمووده چەند لاوازیەکی تیایە

- لاوازی قاسمی کوڕی عەوفی شەیبانی
- جیاوازی زۆر لە گێڕانەوەکاندا.
- جیاوازی لە مەتنەکەدا، لە شوێنێکدا دەڵێ لە شام گەڕایەوە، لایەکی تر دەڵێ لە یەمەن
- پچڕانی سەنەدەکە لە نێوان أبي ظبيان و معازدا.
پوختەی قسە: ئەم فەرمودە نابێتە بەڵگەو پشتی پێ نابەسترێ.

١١ - یەکێک لەو کارە نەگریس و دوور لە شەرع و دین و ئینسانیەتە کە بەناو شێخەکان دەیکەن و مریدەکانیانی پێ سوک و زەلیل و زەبوون دەکەن سوجدە بردنی موریدەکانە بۆ شێخەکانیان، بەڕاستی ئەوکارە، جگە لەوە کە تاوانێکی زۆر گەورەیەو حەرامە، ئەگەر بۆ ڕێزبێ و بۆ پەرستن نەبێ، ئەگەر بۆ پەرستن بێ شیرکی گەورەیە، زەلیل کردن و سوک سەیر کردنی ئەو خەڵکە داماو کەم عەقڵانەیە، هەر کەسێک بیکات و بە هەر بڕو بیانویەکەوە بکرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: [وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ

الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا] خوای گەورە ڕێزی لەو ئینسانانە ناوە، چۆن دەکرێ کەسانێک بەناوی دینەوە لەژێر سێبەری ئیسلامدا ئاوا بکەن لە خەڵک، زانایان و مامۆستایانیش کەڕو بێدەنگ بن، بەڵکو هەندێکیان سەردانیان دەکەن و لە کۆڕی زیکرە ناشەرعیەکان دادەنیشن و ڕێزی گەورەیان لێ دەگرن.

بەراستی هیچ بەڵگەیەک نیە بۆ دروستی کارێکی ئاوا، بەڵێ لە قوڕئاندا باسی سوجدەی ڕێزی مەلائیکەتەکان بۆ ئادەم کراوە، کە خوای گەورە فەمانی پێکردوون، دووەم سوجدەی ڕێزی یعقوب و خێزانی و کوڕەکانی یەعقوب پێغەمبەر علیه السلام بۆ یوسف باسکراوە، ئەوە دوو ڕووداوی تایبەت بوون و بۆ کەس نیە ئەوانە بکاتە بەڵگەی دوستی کارێکی ئاوا، ئەگەر سوجدە بردن بۆ ڕێزیش دروستبوایە، شیاوترین کەس بۆ ئەو ڕێزە پێغەمبەرە ﷺ هاوەڵان دەیانکرد، نازانم ئەوکەسانەی دەڵێن دروستە سوجدە بۆ شێخ و کەسی گەورە ببرێ چۆن لە خوا ناترسن فەتوای ئاوا بێ شەرعی و حەرام دەدەن.

## تەوەسول و وەسیلەی شەرعی و ناشەرعی:

الوسیلة: لە زمانی عەرەبیدا: شوێن و پلەو پایەیە لای پادشا یەکەم: واتای (الوسیلة) لە زمانی عەرەبیدا کە دەوترێ (وَسَّلَ فلانٌ إلى اللَّهِ وَسِيلَةً) کردارێکی چاک بکات و بەوکردارە لە خوا نزیک بێتەوە،

دەوترێ (وتَوَسَّلَ إِليه بوَسِيلَةٍ) واتە: بەکردارو هەوڵدان لێی نزیک بویەوە.[٧٦]

مەبەستی دووەم: تەوەسول و وەسیلە لە زاراوەدا

- هەرشتێک کە پێی نزیک دەبیتەوە لە کەسانی تر تەوەسولی پێ دەوترێ.

- وەسیلە: بە هەرکارێک دەوترێ کە پێی نزیک دەبێتەوەو دەیگەیەنێتە شوێنەکە، وەسیلە لە فەرموودەی (اللهمَّ آتِ مُحَمَّدًا

٧٦ -(لسان العرب ١١/ ٧٧٢ مادة (وسل).

الوَسِيلَة) مەبەستی نزیک بونەوەیە لە خوای باڵا، هەندێک دەڵێن: مەبەست شەفاعەتی گشتیە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەندێک دەڵێن: وەسیلە شوێنێکە لە شوێنە بەرزەکانی بەهەشت، فەرموودەکە پشتگیری ئەم بۆچوونە دەکات.

- وەسیلە: هەرکارێک نزیکت بکاتەوە لە خوای گەورە بە عیبادەت و نوێژو پاڕانەوەو یادی خوا،و گوڕایەڵی فەرمانی خواو وازهێنان لەو شتانەی خوای گەورە نەهی لێکردووە، زانایانی تەفسیر دەڵێن (وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ)[٧٧] نزیک بوونەوەی بەندەیە بەو عیبادەت و خواناسیەی لە پێشەوە باسمان کرد.

- تەوەسول نزیک بوونەوەیە لە خوای گەورە لەڕێی داوای دوعاکردن لەکەسانی تر، واتە: بە کەسێکی زیندو بڵێی دوعام بۆ بکە. لە فەرموودەدا هاتوە: [مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، إِلاَّ قَالَ الْمَلَكُ: وَلَكَ بِمِثْلٍ)[٧٨]

---

[٧٧] -[المائدة: ٣٥]
[٧٨] - صحيح مسلم؛ برقم ٢٧٣٢

- تەوەسول: نزيك بوونەوەيە لە خوای گەورە بە ناوو سيفاتی خواو بە دروستكاوانی خوا وەک پێغەمبەرو پياوچاكان و عەرشی خواو چەندين شتی تر.[٧٩]

- تەوەسول: نزیک بوونەوەیە لە خوای گەورە بە تاعەت و عیبادەت و شوێن کەوتنی پێغەمبەران و هەر کردارێک کە خوای گەورە پێیخۆش بێ و پێی رازیبێ دەبێتە تەوەسول.[٨٠]

- ئەو وەسیلەی کە لە فەرمودەکەدا هاتوە مەبەستی شوێنێکە لە بەهەشتا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: دوای وەڵام دانەوەی بانگ داوای وەسیلەم بۆ بکەن، وەسیلە شوێنێکە لە بەهەشتا، تەنها بۆ بەندەیەک دەبێ لە بەندەکانی خوا، ئومێدەکەم ئەو بەندە من بم، هەرکەس داوای وەسیلەم بۆ بکات شەفاعەتی منی بۆ مسۆگەر دەبێ.[٨١]

---

[٧٩] - (الموسوعة الفقهية الكويتية ١٤/ ١٤٩، وانظر: قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة ص١٣ وما بعدها، وتفسير الألوسي ١٢٤/٦)
[٨٠] -(التوصل إلى حقيقة التوسل لمحمد نسيب الرفاعي ص ٢٠)
[٨١] -(الحديث أخرجه مسلم، صحيح مسلم ١/ ٢٨٨.

## جۆرەکانی تەوەسول:

پێش ئەوەی بێمە سەرباسی جۆرەکانی تەوەسول بە گرنگم زانی پوختەی بۆ چوونی شێخ محمد عبدالوهاب لەبارەی تەوەسولەوە بێنم، بۆیە هێناشم پێم وایە رونکردنەوەی جوانەو گرنگیشە.

دەڵێ: بابەتی باسکردنی تەوەسول شوێنی بایەخی ئێمە نیە، هەندێک لە زانایان تەوەسولیان بە پیاوچاکان بەدروست زانیوە، هەندێکیش تەوەسولیان تایبەت کردووە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، زۆرینەی زانایان بە دروستیان نەزانیوەو رێگریان کردووە، بابەتی تەوەسول بابەتێکی فیقهیە، ئێمە تەوەسول بە پێغەمبەر ﷺ بە کارێکی ناپەسندو خراپ دەزانین بەڵام ئەگەر کەسێک بیکات، سەرزەنشتی ناکەین، چونکە لە بابەتی ئیجتیهادا سەرزانسکردن و دژایەتی کردن نیە، بەڵام دژایەتی ئێمە بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دروستکراوەکان بە شێوەیەک دەپارێنەوە بەو گرنگیە لە خوای تعالی ناپاڕێنەوە، دەچنە لای مەرقەدی شێخ عبدالقادرو شێخ مەعروفی کەرخی و کەسانی تر، داوایان لێ دەکەن

له نارِهحهتی و پهژارهو نهبوونی رزگاریان کهن و داوای منالّ و چاک بونهی نهخۆشیان لێ دهکهن، ئهمانه له کوێ و لهگهڵ ئهوانهی بهدڵی پاکهوهو ملکهچی تهواو له خوا دهپارِێتهوهو لهگهڵ پارِانهوه له خوا داوا لهکهسی تر ناکات، تهنها ئهوهندهیه له پارِانهوهکهیدا دهڵێ، خوایهگیان داوات لێ دهکهم لهبهر خاتری پێغهمبهر یا پێغهمبهران، یا لهبهر خاتری پیاوچاکان، یا فلاّن پیاو چاک لێم خۆشبه یا فلاّن کارم بۆ بکه، یا دهچێته لای گۆرِی پیاوچاکێک و دهپارِێتهوه، بهلاّم له پیاو چاکهکه ناپارِێتهوهو تهنها له خوا دهپارِێتهوهو باوهرِی تهواوی وایه ههرخوا خۆی کارهکانی بۆ دهکات نهک فلاّن و فیسار شێخ، چۆن ئهمانه جیاوازنین لهگهڵ ئهوانهی له شێخ و گۆرِی شێخ دهپارِێتهوهو پهنا بۆ ئهوانه دهبهن.[٨٢]

[٨٢] -(مجموع مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب (٢/ ٤١) ط ١، دار القاسم)

تەوەسول بە شێوەیەکی گشتی دەبێتە دووبەش، تەوەسولی بونیەتی و تەوەسولی شەرعی:

یەکەم تەوەسولی بونیەتی: هەموو هۆیەکی سروشتیە کە دەیگەیەنێتە ئەو مەبەستەی کە لەکاتی دروستکردنیدا لەسەری دروستکراوە.

ئەوەش کافرو موسڵمان تێیدا بەشدارن بەبێ جیاوازی، وەک ئاو وەسیلەی تێر ئاوبوونە، خواردنی نان وەسیلەی تێربوونە، لیباس وەسیلەی پاراستنە لە گەرماو سەرما .... هتد.

دووەم تەوەسولی شەرعی: هەر هۆکارێکە کە لە ڕێگای شەرعەوە بت گەیەنێتە مەبەست و لە قورئان و سوننەت بەیان کرابێ.

بۆ نمونە: وتنی شەهادەت ئەگەر لەبەر ڕەزامەندی خوابێ بە تێگشتنەوەبێ وەسیلەی چونە بەهەشت و ڕزگاربونە لە مانەوەی هەمیشەیی لە جەنەمدا، کرداری چاک دوای تاوانی بچوک وەسیلەیە بۆ سڕینەوەی تاوانەکە، بەجێ هێنانی سیلەی ڕەحم تەمەن درێژ دەکات و ڕزق زیاد دەکات، سەدان شتی تر.

بەشێوەیەکی تر تەوەسول یا شەرعی و رێگە پێدراوە، یا ناشەرعی و بیدعەیە.

مەبەستی یەکەم: تەوەسولی دروست و رێگە پێدراو لە شەرعدا:

تەوەسولی شەرعی و دروست هەموو ئەو شتانەیە خوای گەورە رێنمایی کردوین بۆی لە قورئانداو پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکاندا رۆشنی کردۆتەوە بۆمان.[٨٣]

جۆرەکانی تەوەسولی شەرعی و دروست:

١ - تەوەسول بۆلای خوای گەورە، بەزاتی خواو ناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی هەموو شەرعزانان هاودەنگن کە تەوەسول بەناوو سیفاتی خوای گەورە سوننەتە، بۆکارو پێویستی دونیاو دوارۆژ.[٨٤]

---

٨٣ -(التوصل إلى حقيقة التوسل للرفاعي ص ٢٠)
٨٤ -(الموسوعة الفقهية الكويتية ١٤/ ١٥٥)

ئەوە بەرزترین جۆرەکانی تەوەسولە بۆلای خوای تعالی لە هەموویشی نزیکترە بۆ گیرابوونی پاڕانەوە[٨٥]

خوای گەورە دەفەرموێ: [وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)[٨٦] وە دەفەرموێ: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ)[٨٧]

٢ - تەوەسول بە باوەڕهێنان بەخواو بە قورئان و پێغەمبەر ﷺ بەڵگە:

[رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنْزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ][٨٨]

فەرموودەی سەحیحە (اللهم مَن آمن بك وشهد أني رسولك، فحبِّب إليه لقاءك، وسهِّل عليه قضاءك، وأقلِلْ له من الدنيا، ومَن لم يؤمن بك ويشهد أني رسولك، فلا تحبب إليه لقاءك، ولا تسهل عليه قضاءك، وأكثر له من الدنيا)[٨٩]

---

٨٥ - (التوصل إلى حقيقة التوسل لمحمد نسيب الرفاعي ص ٢٣)

٨٦ - سورة غافر آية: ٦٠

٨٧ - سورة البقرة آية: ١٨٦

٨٨ - آل عمران: ٥٣

٨٩ - أخرجه ابن حبان في صحيحه (٢٠٨)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح

٣ - تەوەسول بە کردەوە چاکەکان:

هەموو زانایانی شەرع هاودەنگن لەسەر دروستی تەوەسول بەکرداری باش، ئەو کردارانەی کە ئینسان لەبەر ڕەزامەندی و نزیکبوونەوە لە خوا دەیانکات.[٩٠]

بەڵگەی تەوەسول بەکردەوەی باش زۆرن تەنها بە کورتی ئەم بەسەرهاتە باس دەکەم: بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەی کە عَبْدَ اللَّەی کوڕی عومەر - خوا لە هەردوکیان رازی بێ دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی سێ نەفەر لە ئومەتانی پێش ئێوە بە ڕێگەدا ڕۆشتون هەتا شەویان هات بەسەرداو چونە ئەشکەوتێک بۆ ئەوەی لەوێ بمێننەوە، کاتێک چونە ناو ئەشکەوتەکە بەردێکی گەورە لە شاخەکە تل بویەوەو بەردەم دەرگای ئەشکەوتەکەی لێگرتن و ڕێگەی دەرچونیان نەما، وتویانە بۆ ئەوەی خوای گەورە ئەم بەردەمان بۆ لابات دەبێ هەر یەکەمان باسی کردەوەیەکی باشی خۆی بکات و بیکاتە

[٩٠] -(الموسوعة الفقهية الكويتية ١٤/ ١٥٢)

وەسیلە بۆ قبوڵ بوونی پاڕانەوەکەی، یەکەمیان باسی هەڵسوکەوتێکی چاکی لەگەڵ دایک و باوکی دەکات و پاشان دەڵێ: خوایە ئەگەر لەبەرتۆ کردومە ئەم بەردە لادە بۆمان و رزگارمان بکە, تۆزێک بەردەکە دەجولێ، بەڵام توانای دەرچونیان نیە، دووەمیان: باسی ئەوە دەکات کچێکی ئامۆزای زۆر خۆشویستوە، لەسەرەتادا بۆ هەلێک گەڕاوە لەگەڵی کاری ناشەرعی بکات بەڵام ئامۆزاکەی زۆر داوێن پاک بووەو پاشان هەلێکی بۆ رێدەکەوێ کە ئامۆزاکەی لەتاو نەبوونی لە بەرانبەر هەندێک ماڵ و سامان ناچار رازی بووە بەڵام لە کۆتاییدا ئامۆزاکەی پێی دەڵێ لە خوا بترسە بە حەرامی ئەوکارەی لەگەڵ نەکات و ئەویش لەبەر خوا وازی لێدێنێ و هەرچی ئاڵتون و پارەشی پێداوە پێی دەبەخشێ، پاشان دەڵێ: خوایە ئەگەر لەبەرتۆ کردومە ئەم بەردە لادە بۆمان و رزگارمان بکە, بەردەکە نەختێکی دەجولێ بەڵام توانای دەرچونیان نیە، سێیەمیان: دەڵێ چەند کرێکارم هەبوو پارەی هەموویانم دا دانەیەکیان وەری نەگرت و رۆشت، منیش بۆم خستە ئیشەوە دوای چەند ساڵێک هاتەوە داوای

پارەکەی کرد، منیش وتم بڕۆ ئەو حەیوانانە هەمووی ئیتۆیە بیبە، هەمووی برد، خوایە ئەگەر لەبەرتۆ کردومە ئەم بەردە لادە بۆمان و رزگارمان بکە، بەردەکە جوڵاو هەموویان رزگاریان بوو و رۆشتن. فەرموودەکە (متفق علیه)یە بۆ دەقی فەرموودە بگەڕێنەوە بۆ بوخاری و موسلیم.

## دوعاو پاڕانەوەی باوەڕدارە بۆ براکەی.

ئەم دوعایە دوو جۆرە:

١ - ئەوەیە کەسێک داوا لە برا موسڵمانەکەی دەکات دوعای خێری بۆ بکات، ئەویش دوعا بۆ دەکات.

٢ - ئەوەیە کەسێکی باوەڕدار خۆی دوعای خێر بۆ براکەی دەکات، بەبێ ئەوەی براکەی پێی وتبێ وئاگاداربێ و پێی بزانێ، ئەم جۆرە دوعایە زۆر گرنگە موسڵمان بیکات بۆ براکانی چونکە سودی بۆ براکەیی و خۆیشی هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ، قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ)[٩١]

دوعای موسڵمان بۆ براکەی بێ ئەوەی پێ بزانرێ، وەرگیراوە، ئەو فریشتەی کاری ئەو پێ سپێراوە لای سەریەوە هەکاتێک دوعا بکات بۆ براکەی، ئەو فریشتە دەڵێ: ئامین وێنەی ئەو دوعایەت بۆتۆش بێ.

[٩١] -(صحيح مسلم؛ برقم: [٢٧٣٣]).

٣ - لەکاتی نوێژی جەنازەدا چونکە نوێژی جەنازە، پاش الله اکبری سێیەم دووعایە بۆ مردووەکە

٤ - دوعا بۆ باوەڕدارانی نێو گۆرستان لە کاتی سەردانی گۆڕستاندا.[٩٢]

باسی سێیەم و کۆتایی ئەو تەوەسولەیە، نا شەرعیە:

تەوەسولی ناشەرعی ئەو شتانەیە کە بەندە بەکاری دێنێ بۆ نزیک بوونەوە لە خوای گەورە، پێچەوانەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوەش دووجۆرە.

یەکەم: تەوەسول بە بتێک لە بتەکان یا هەر پەرستراوێک لە پەرستراوەکان، جا ئەو پەرستراوە ئینسان بێ یا هەرشتێکی تربێ، ئەم جۆرە تەوەسولە شیرکی گەورەیە، خاوەنەکەی دەبێتە موشریک.

دووەم: لە تەوەسولی ناشەرعی ئەوەیە کە دەوترێ خوایە بیکەی بە خاتری پێغەمبەر، پێغەمبەران، فڵان پیاو چاک، پیاوچاکان، وەک کە

[٩٢] -(التوصل إلى حقيقة التوسل ص ١٤١)

دەوترێ: (أسألك يا ألله بنبيك، أو جاه نبيك، أو حق نبيك، أو جاه الأنبياء، أو حق الأنبياء، أو حق الأولياء، أو جاه الأولياء والصالحين، يا شێوەی ئەمانە.

ئەم شێوە تەوەسولە کارێکی بیدعەیە ترس هەیە وردە بەرەو شیرک بڕوات، لەبەر ئەوە باش وایە موسڵمان خۆی بەدووربگرێ و بەهیچ شێوەیەک لێی نزیک نەبێتەوە، چونکە ئەگەر کارێکی شەرعی و دروست و چاک بوایە، پێشینە چاکەکان وەک هاوەڵان و تابیعین و دوای ئەوان دەیان کرد، عیبادەتیش تەوقیفیە و بەبێ بەڵگەی شەرعی ڕێگە پێدراونیە.

## پەیامێك بۆ گۆڕپەرستەکان:

ئەی گۆڕپەرستەکان، خواتان کێیە و کێ دەپەرستن؟

ئەگەر بە موسڵمانێکی یەکخواپەرست بڵێیت کێ خواتە، دەبێ وەڵامی چی بێت؟

بێ گومان وەڵامەکەی ئەوەیە کە: پەروەردگارم (الله)یە کە دروستی کردووم و هێناومێتیە بوون، پەروەردگاری من و گشت دروستکراوەکانی دیکەشە، پەرستراوی منە و هیچ پەرستراوێکی دیکەم نییە جگە لەو نەبێت؛ بەڵگەش فەرموودەی خوایە: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

هەموو ئەم جیهانەش جگە لە خوایە و منیش تاکێکم لەم جیهانەدا.

هەر ئەو دەپەرستم و لە کاتی خۆشی و ناخۆشی هەر هاواری ئەو دەکەم و هەموو جۆرەکانی بەندایەتی هەر بۆ ئەو زاتە دەکەم.

جا ئەگەر پێی وترا: دەی چۆن و بە چی پەروەردگارت ناسیوە، دەڵێ:

بە بەڵگە و نیشانە و دروستکراوەکانی.

لە نیشانەکانی شەو و ڕۆژ، خۆر و مانگ، لە دروستکراوەکانی زەوی و ئاسمانەکان و هەموو ئەوانی دیکەش: (وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ).

ئیبن کەسیر دەفەرموێت: دروستکەری ئەم شتانە هەر ئەو مافی پەرستش و بەندایەتیکردنی بۆ هەیە.

وە جۆرەکانی بەندایەتیش کە خوا فەرمانی پێ داوە وەك ئیسلام و ئیمان و ئیحسان، لەوانەش دوعا و پاڕانەوە، ترس و ئومێد، پشتبەستن بەخوا و ڕووتێکردنی، ملکەچی و ترسان و گەڕانەوە و پشتپێبەستن و هاوارلێکردن و بۆ سەربڕین و نەزرکردن و جگە لەمانەش لە گشت جۆرەکانی تری بەندایەتیکردن، هەمووی بۆ ئەو پەروەردگارە ئەنجام دەدرێن و هەر شایەنی ئەون و بەس؛ هەر دەبێ هاوار لەو بکرێت و هانا و سکاڵا هەر بۆ ئەو ببرێت، بەڵگەش لە قورئاندا لە هەمووشتێك زۆرترن بە نموونە وەك دەفەرمویٚ: (وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا)

جا لە کاتی تەنگەشە و نارەحەتیدا دەڵێ: (یا الله) فریام بکەوە!

لە کاتی باران و لێزمەدا دەڵێ: (یا الله) فریام بکەوە!

لە شیفای نەخۆشیدا دەڵێ: (یا الله) شیفام بدەیت و چاکم بکەیتەوە!

لە کاتی برسێتی و تینوێتیدا دەڵێ: (یا الله) تێرم کەیت و تێرئاوم کەیت!

لە هەموو کاتەکانی ژیانی و بۆ هەموو داواکارییەکان هاوار لە خوا ئەکات و هەر لەو دەپاڕێتەوە: إیاك نعبد و إیاك نستعین وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ ئیبن عەبباسی فێرکرد کە هاوار و داوای یارمەتی و کۆمەك هەر لە خوا بکات و پێی فەرموو: ( إذا سألت فسأل الله، و إذا استعنت فأستعن بالله).

ئەمە وەڵامی ئەهلی ئیسلام و یەکخواپەرستانە، ئەوانەی دانیان بە تاك و تەنهاییی خوادا ناوە، ئەوانەی کە تەنها خوای تاك و تەنها و ڕاگری زەوی و ئاسمانەکان دەپەرستن.

جا ئێستە با گوێ بگرین بۆ ئەو کەسانەی جگە لە خوا دەپەستن و بەندایەتی بۆ شتانی تر دەکەن و سەیری هاوشێوە و لێکچوونی دڵ و دەروون و پاساو و بیانووەکانیان بکەین:

وەڵامی کەسی نەسرانی

ئەگەر پرسیارت لێ کرد کێ زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە؟ ئەوە بە دڵنیاییيەوە دەڵێ: خوا.

وە ئەگەر لێت پرسی دەی کێ دەپەرستی: پێت دەڵێ: عیسای کوڕی خوا -پەنا بەخوا لە بوختانی وا گەورە- چونکە بەڕاستی ئەو گەیشتۆتە پلەوپایەیەکی ئێجگار بەرز و نەوە و ڕۆڵەی خوایە و شایەنە بەوەی هاواری لێ بکرێت.

جا لە کاتی تەنگەشەدا دەڵێم: ئەی کوڕی خوا بێ بە فریام!

لە کاتی بارانبارینداا دەڵێم: ئەی کوڕی خوا یارمەتیم بدە!

بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشیم دەڵێم: ئەی کوڕی خوا چاکم بکەرەوە و دەردم تیمار بکە!

لە کاتی برسێتی دەڵێم: ئەی کوڕی خوا تێرم بکە و وەرە فریام!

پاش ئەمە گوێ بگرە و بزانە وەڵامی کابرای ڕافیزی چییە و دەڵێ چی؟

ئەگەر پرسیارت لێ کرد کە کێ زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە؟ بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێ: خوا.

جا ئەگەر لێت پرسی کێ دەپەرستی دەڵێ: باوکی عبدالله، حوسەینی کوڕی عەلی -خوا لێی ڕازی بێ-، چونکە بەڕاستی پلە و مەقامێکی ئێجگار گەورە و بڵندی هەیە و بەڵگەی خوایە لەم سەرزەویەدا و هیچ کەس ئەو پلەی ئەوی نییە چونکە پلە و مەقامی ویلایەت تەنانەت لە پلەی پێغەمبەرێتیش بانتر و بەرزترە!

لەبەر ئەوە:

لە کاتی تەنگەشە و نارەحەتیدا دەڵێم: ئەی حوسەین فریام کەوە!

لە کاتی بارانبارینا دەڵێم: حوسەین هاوارم هەر بۆ تۆیە!

بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشینم هاوار هەر لە حوسەین دەکەم و لەو دەپاڕێمەوە!

کاتێ برسیشم بوو بە کەرامات و هاوار لەو تێر دەبم، چونکە ئەو ئاگای لە هاوار و نزوولەی منە و دێ بە هانامەوە و داواکارییەکانم بۆ جێبەجێ دەکات!

سەیر لەوەدایە کە ئەم ڕافیزییانە هاوار لە ئیمامی حوسەین دەکەن - خوا لێی ڕازی بێ- کە بێتە فریایان و لە تەنگ و چەڵەمە و نارەحەتیی ڕۆژگار دەربازیان بکات! کەچی ئەو پێشەوا بەرزە بۆ خۆی لە دەشتی کەربەلادا بەزوڵم و ستەم شەهید کرا و لە تینواندا مرد، کەس نەهاتە فریای و هاواری لە خوای پەروەردگار نەبێ لە هیچ کەسی تر نەکرد. جا یەکێك بۆ خۆی بەبێدەسەڵاتی شەهید بووبێ و هیچی بۆ خۆی نەکردبێ، چۆن دوای مردنی فریای خەڵك دەکەوێت؟!!!

هەر خۆشی نییە بەڵکوو هەموو نەوە و وەچەکانی وەك خۆی پلەوپایەی بەرزیان هەیە و دەبێ هەر لەوانە بپارێینەوە و داوای پێویستییەکانمان هەر لەوان بکەین.

با بزانین وەڵامی سۆفییەکان چییە؟

پاش ئەمە گوێ لە وەڵامی سۆفییەکانیش بگرە، ئەوانەی دۆستانی خوا دەپەرستن بە گۆڕپەرستەکان ناسراون، بزانە ئەوان چی دەڵێن:

ئەگەر ئەمانیش وەك ئەوانی پێشوو پرسیارت لێ کردن لەوەی کە کێ ئەم ئاسمان و زەوی و بوونەوەرەی دروست کردووە؟ بێ گومان وەڵامەکەیان ئەوەیە کە خوا دروستی کردووە.

بەڵام ئایا هاوار لە کێ دەکەن و بەندایەتی و پەرستش بۆ کێ دەکەن، بێگۆمان ئەمانیش هەریەك بەپێی خۆی و تەریقەتی خۆی هاوار لەو شێخە دەکات کە ئەم موریدێتی و لەبەر قاپیی ئەودایە، قادری هاوار لە شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەکەن، نەقشبەندی هاوار لە شێخ عوسمان و ئەوانی دیکە دەکەن و وە هەروەها.

دەی با هەموو بەیەکەوە بڵێین:

خوایە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆ لەسەر نیعمەتی تەوحید و یەکخواناسی، کە ئێمەشت وا گومڕا نەکردووە و ڕێگەی ڕاستمان دیوەتەوە و پێی ئاشنا بووین.

خوای گەورە (سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ* وَإِذَاْحُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ) (ئەوە کێ لەو کەسە ستەمکارترە، هاوار لە جگە لە خوا ئەکات کە هەتا ڕۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوە و ئەوانە (واتە ئەوانەی هاواریان لێ دەکەن) لە دوعا و هاواری هاوارلێکەرانیان بێئاگان؟ وە کاتێکیش کە خەڵکی گرد ئەکرێنەوە و کۆ ئەکرێنەوە، ئەوانە (واتە هاوارلێکراوان) دەبنە دوژمنی (هاوارلێکەرانیان) و بەبەندایەتییەکەیان بێباوەڕن).

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.